شـــارل پێـــی

RASPOUTINE

# راسپۆتین

کەشیشێکی
داوێن پیس و فێڵ باز!



چاپی دووەم
٢٠١٣

وەرگێر
عمر محمد احمد (هۆما)



# راسپۆتین

## کەشیشێکی داوێن پیس و فێڵ باز

## داستانی راسپۆتین

بەرهەمی نوسەری فەرەنسی: شارڵ بتی

عمر محمد احمد (هۆمەر) لە عەرەبییەوە کردوویەتی بە کوردی

ناوی کتێب/ چارەسەری خەمۆکی
بەرهەمی نوسەری فەرەنسی: شارڵ بتی
تایپ/ وەرگێڕ
عمر محمد احمد (هۆمەر) لە عەرەبییەوە کردوویەتی بە کوردی
تیراژ/١٠٠٠
شوێنی چاپ: چوارچرا
نرخ: ٤٥٠٠ دینارە
ساڵی چاپ/ ٢٠١٣ ز
لەبەڕێوەبەرایـەتی گشـتی کتێبخانـە گشـتیەکان ژمـارە (١٩٥٧ ) سـاڵی ٢٠١٣ ی پێدراوە .

## پێشەکی

داستانی (راسپۆتین) دووهەمین چیرۆکە لە زنجیرەی چیرۆك و داستانی مێـژوویی بـەکوردی، ئـەم داسـتانە، چـیرۆکێکی ڕاسـتەقینەو ژیـان و بەسەرهاتی کەشیشێکە (قەشە) لەژێر پەردەی ئاینی (پیرۆزی مەسیح)دا، ئەوەی نەکراوە کردوویەتی لە داوێن پیسی و پیاو خراپی، وە هەر لەژێر پەردەی ئاینی (مەسیح)دا گەورەترین تۆڕی سیخوڕی گێڕاوە لە ڕژێمە پان و بەرینەکەی ڕوسیای قەیسەریدا، بەدەیان، وەزیرو-ژەنڕاڵ و فەرمانبەری گەورەو خاوەن پلەو پایەی ڕژێمی لە تکابووە.

نوسـەری ئـەم داسـتانە (شـارل بتـی)یـە، فەرمانبـەرێکی گـەورەی باڵیۆزخانەی فرنسە بووە لە ڕووسیا بەر لە هەڵگیرساندنی ئاگری جەنگی یەکەمی جیهانی.

بـەوەی نوسـەر شـارەزاو پسـپۆڕبووە لـە نـەریتی گـەلانی وڵاتـانی ڕۆژهەڵاتی دوور (واتە: ژاپۆن و کۆریا و چین و میللەتی ژێر چەپۆکی ئەو سـەردەمەی ڕژێمـی قەیسـەری لەڕوسـیا) وە لـە نزیکـەوە هـەموو جـۆرە شارەزاییەکی دەربـارەی راسپۆتین کۆکردۆتـەوە، لـەم داسـتانەدا، شـارڵ بتی، لەوە ئەچێ بەدرێژایی ژیانی راسپۆتین هەر بە دوویەوە بووبێ، وەك ئەو دوو فریشتەیەی خوای گەورە لەسەر شانی مرۆڤ داینـاون تـاکو ورد و درشتی کرداری چاکەو خراپەی مەردم تۆماربکەن.

شارڵ بتی بەوپـەڕی وزە و توانـاوە ئـەوەی پێویست بووبێ لە ڕووداوە سـەر سـوڕهێنەرەکانی ژیـانی راسـپۆتینی لـەم چـیرۆکە مێژوویـەدا بـە تۆمـارکردن جـێ کردۆتـەوە، هـەروەها گـەلێ دیمـەنی ڕاستەقینەی ژیـانی ئـاخنراو بـە برسـێتی و نـەبوونی قـات و قـڕی خـەڵکی ئـەو سـەردەمەی جـەنگی یەکـەمی بۆ خسـتوینەتە بەرچـاو لەتـەك ئـەو زەماوەند و شـایی

لۆغـان و ڕابواردنانـەی لـە تیاتروخانـەکان دا گیـز ئـەدران بـەدەم ئـاوازی مۆسیقا و گۆرانی و خواردنەوەوە بۆ بەرزکردنـەوەی گیانی هەرەسهێنانی ورە لـە ڕژێمـە هـەرەس بردووەکـەیان دا وە بـۆ داپۆشـینی کارەسـاتە دڵ تەزێنەرەکانی هێڵەکانی شەڕ لە ڕووی بەزین و زەوی بە دەستەوەدان بە دوژمن و کوشتن و بڕینی لەڕادەبەدەری ڕۆژانـە لـە هێـزی بەگژیاکا چووی هەردوو بەرە لەشەڕ هەڵگیرسێنەرانی ئاگری جەنگی یەکەمی جیهانی، کە هەواڵەکانیان وەك تێسکە بە هەموو کون و قوژبنێکی ڕژێما بڵاوئەبووەوە. و لە سنوریش تێپەڕیان ئەکرد بەرەو هەندەران.

شــارل بتــی، زۆر بــەوردی و بەشــێوەیەکی زانیاریانــە هۆیــەکانی هەڵگیرساندنی ئاگری جەنگی یەکەم شی ئەکاتەوە کە چۆن چاوچنۆکی سەرمایەدارە گەورەکان بۆ داگیرکردنی وڵاتان و تالآن کردنیان و کردنیان بە بازاڕی کڕین و فرۆشتن بۆ خۆیان هـەزاران هـەزار درۆو دەلەسەی دوور لـە هـەموو ڕاستییەکیان ئەهێنایەوە بـەوەی کە هـەر لایەکیان بـۆ سـود و بەختـەوەری دواڕۆژی مرۆڤایـەتی و ئـازادی گـەلان تێئەکۆشـن بـە نیـازی سـەرفرازی تـەواوی مـرۆڤ لـە دیلێتـی چەوسانەوەو دەردەسـەری ژیـان، داستانی راسپۆتین لە گەڵ سەرەوە لە داستانە مێژووییە سەرکەوتووەکان ئەدرێتە پێنووس.

بەداخەوە لەچاپدانی گەلێك دواکەوت، چونکە هـەر بە دووای (داستـانی جـەنگیزخان)دا ئـەمیش بخرێتـە ژێـر چاپەوە، بـەڵام ڕۆژگـار بـە ئـارەزووی کەس ناگەڕێت.

**پاڵەوانەکانی ئەم داستانە**

**راسپۆتین:** قەشە کریکۆر ئیفیمۆفتش.

**بەرنابا:** دەروێشێکی دەست بڕ لە کۆنە برادەرانی سەردەمی منداڵی راسپۆتین.

**ئانا فیڕۆ بۆنا:** گەورەی کەنیزەکەکانی ناو کۆشکی قەیسەر

**ئەلکسەندەر فیدۆرفنا:** شابانو، ژنی قەیسەری ناوبراو لەم داستانەدا.

**نیکۆلای دووەم:** قەیسەری ڕوسیا.

**نیکۆلا نکۆلافتش، دیمتری بافلوفتش:** دوو کوڕە مامی قەیسەر.

**یوسۆبۆف:** ئەمیرێکە لە بنەماڵەی قەیسەرو مێردی (کچی خوشکی قەیسەر)یشە.

**کاترینا:** کچێکی سەماکەری یاری و سەماکردنی بالەیە لە ئۆپێرا.

**بۆریکلیفتش:** نوێنەر لە ئەنجومەنی (دۆما) واتە پەرلەمانی ئەو سەردەمەی ڕوسیا.

**لەژێر ئاسمانی شین دا**

سیبیریا ئەو زەویە سەهۆڵ بەندان و بەستەڵەکی بە درێژی و پانی چۆکی لەسەر سنگی زەمین داداوە، ئەوە هەر هیچ کێ چلەی زستان بە سەرماو سۆڵەی سەختیەوە، سەرتاپای ئەو دەشت و دەرەی لە دەمی زستانەوە رەنگ کراوە بە بەفر بەتەواوی کاڵ نابێتەوە، خۆ ئەوەش هەر هیچ بە درێژایی زستان چ قورەتە پەڵە هەورێ بوێرێ رووی ئاسمانی شین و بێ گەردی سیبیریا لەکەدار بکا، لەکوێ هەور ئەوێرێ روو بکاتە سیبیریا؟ بێ گومان هەور ئاوە، بۆ ئاویش نەهاتووە خۆی راگرێ لە رووی سەرماو سۆڵەی لە وزە بەدەری ئەوێ. بۆیە پاش کرێوە ئەبێتە پێچە کلوو وەك لۆکەی شی کراوە دێتە خوارێ یا ئەبێتە تەرزە وەك کوچك و بەرد ئەکەونە خوارەوە، بە کورتی تا پلەی سەرما لە رۆچوون دا بێ ئاسمان شین ترو بێ گەرد تر ئەبێ.

لەناو ئەو زوقم و سەهۆڵ بەندانەدا خانوو بەرەکانی گوندی (بۆکرۆنسکی) کە بریتیە کۆمەڵە زنجێکی کۆنی شەق و شری هەرەس بردوو لەو گۆرەدا قیت بۆتەوە.

لەم زستانە سەختەدا زەوی و زاری ئەم گوندە نەك هەر شینایی تیا نابینرێ و بەس بەڵکو هەر وەکو ئاوەدانیش نەبێ وایە، ئەگەر چی زۆر لەمێژیش نیە بەروبوومی خەلە و دەغڵ و دانی ساڵانەی دروێنە کراوە و بە داشقە و گالیسکە و کەرو بار گوێزراوەتەوە.

وا ئێستا جوتیارەکانی ئەم گوندە سەرماو سۆڵەی ئەم زستانە کەسیرەی کردوون بەناچاری خزاونەتە ناو ژووری زنجەکانیانەوە بە درێژایی وەرزی زستان رەش نانێنە سەر سپی، خۆ ئەگەر هەر ئەو سەرە نوێلکانەی دەوروبەری زنجەکان نەبوایە کە تەپاڵە و سوتەمەنی تیا هەڵ چنراوە لە دوورەوە کەمێك رەش ئەکەنەوە ئەگینا بۆ رێبوارێکی نەشارەزا

کە بۆ نەگبەتی ئەو دەرو دەشتەی گرتبێتەبەر هەرگیز دڵی ختورەی ئەوەی نەدەکرد کە لەو شوێنە کش و ماتەدا ئاوەدانی هەیە!

تەنها دوو فەرسەخ دوور لەم گوندە جەنگەڵێکی زەبەندو چڕی ئەوتۆ هەیە کە تارێکی دیمەنی تەرمێکی سامناکی ترسێنەری بە دەوری ئەم گوندەدا کێشاوە، دڵی پیاو ئەگوشێ.

خانووبەرەی ئەم گوندە هەمووی لە یەك ئەچن، خانوبەرەیەکی کەمی دوور لە کوختەکانی تر هەیە، خاوەنەکەی ناوی (گریگۆر ئیفیمۆفتش)ە کە نازناوی (راسپۆتین)ە، خانووبەرەکەی ئەمیش هیچی لەوانی تر نەگەڕاوەتەوە، گوێسەبانەو دەرگاو پەنجەرەکانی نیشانەی هەژاری و دواکەوتن و بێ زەوقی پیشان ئەدا.

ئەگەر لە دەرگای ئەم خانووە بچینە ژوورەوە لە سەرەتادا لەبەر تاریکی چاوچاو نابینێ، چونکە تیشکی ڕۆژ بەو شوێنە ئەوەندە ئاشنا نیە، وەبگرە نەوێرێ بچێتە ژوورەوە، لەبەر دەمی ئەم شوێنەدا سۆپەیەکی قوڕین هەیە بەتینی گەرمی سوتەمەنی سوور هەڵگەڕاوە بۆتە سواڵەت، ئا لەو سۆپە سواڵەتەدا چەند پارچە دارێکی تەڕ داگیرساوە بە شێنەیی و لەسەرخۆ دووکەڵ پەخشان ئەکا بە ژوورەکەدا، خۆشمان نازانین ئەم شوێنە چی ناو لێبنێین؟

لە ڕاستیشدا هەموو شتێکە، دالانە، چێشت خانەیە، ژووری نوستنە....هتد.. لە ناوەڕاستی ئەم شوێنەدا مێزێکی گێڕی نان خواردن دانراوە، بە چواردەوریا چەند کورسیەکی شەق و شڕی پینەکراو هەیە، ئیتر ئەم شوێنە یا ئەم ژوورە بە شڕو شیتاڵ پڕکراوەتەوە، لەناو ئەم کەلو پەلانەدا گیانلەبەری وەك کێچ و ئەسپێ لەگەڵ ئەوە و وەچەکانیان بە ئارەزووی خۆیان تەراتێن ئەکەن و ڕێچکەیان بەستووە، لەسەر یەکی لەو چرپایانەی ناو ئەم ژوورە تێك خزاوەرنە بە مارەیەکی راسپۆتین ئەنوێ،

لەگەڵ منداڵەکانی، هەروەها دۆستەکانیشی- کەبریتین لەو ئافرەتە دەعبا سوکانەی لە سەد ئاویان داوەو قولە پێیان تەڕ نەبووە- هەموویان لەم شوێنەدا ژیان بەسەر ئەبەن، وە لەژێر بنمیچی ئەم کولانە گەورەیەدا کۆبونەتەوە. ئەگەر بە وردی چاوێك بەم کولانە بەرینەد بگێڕین ئەبینین لە هەموو ڕەگەزە ئادەمیزاد یەکیان گۆتووە، سەرمای سیبیریا کەسیرەی کردوون، بەڵام گەرمی و تاریکی ئەم شوێنە لەشیانی خاو کردۆتەوە، بۆیە شەو و ڕۆژ سەریان کردۆتە سەر نوستن، دووەم ئۆکسیدی کاربۆن کە لە دوکەڵی دارە تەڕەکانی سوێیەکە هەڵئەسێ قانگی داون، ئەمە جگە لە هەڵاوی هەناسەو بۆن و بەرامەی ئەو کەوڵە چەرمانەی جلوبەرگی گەرمیانە -کە هێشتا بەتەواوی دەباغی نەکراون- تێکەڵ بەو بۆنە کەسکونە ئەبێ کە لەپێ و پێڵاوەکانیان، وە لەبەرماوەی چێشتەکانیان هەڵئەسێ، ئەم بۆگەنانە بە تێکڕایی شوێنەکەیان کردۆتە کونە ڕێوی یا تەویلەی ئاژەڵ لەوانەی دوورن لە دەستی پاك کردنەوەی ئادەمیزاد.

ئەگەر لەم شوێنەدا سەرنج بدەین دەرگایەکی بچوك ئەبینین لە پشتیەوە کۆلیتێکە بەرازێك و مانگایەك لەگەڵ ئەسپێکی بچووکی تیسکنی تیا ئەژی. جگە لەمانە چەند مریشکێکیش بۆ دان خواردن و چینەکردن لەم کۆلیتەدا هات و چۆیانە، ناوە ناوە گارە گار ئەکەن، ئا ئەمانە کەس و کاری ڕاسپۆتین، ئەی ئەبێ خاوەن ماڵ خۆی لەکوێ بێ، ئەویش ئا ئەوەتا لە کونجێکی ئەم ژوورە گەورەیەدا لەبەردەم مۆم دانێکا، بەشێنەیی شەراب فڕ ئەکا، ئەو خواردنەوەیەشی (ڤودگا)یە خواردنەوەی هەرە بەناوبانگی ڕوسیا، لەبەر ئەم مۆم دانەدا ڤوتیلەیەکی نەوتی شەو و ڕۆژ دوکەڵ بە ژوورەکەدا پەخش و بڵاو ئەکاتەوە، وا ڕاسپۆتین لەم شوێنە پیرۆزەدا بەدەم ڤومی شەراب خواردنەوەوە چاویدانی خۆی ئەکا.

کە دوا دڵۆپی شەرابەکەی خواردەوە، هەستی بەوە کرد کە پێویستی

بەوە هەیە هەندێ بای خاوێن و فێنك بۆسنگە پانەکەی هەڵمژێ، بەم نیازە چووە دەرەوە بۆ هەڵمژینی بای پاکژی ئەو دەرودەشتە ساردە.

ئەگەر لەم هەڵوێستەیدا لە کونێکەوە چاوت لێبوایە پیاوێکی سەیرت ئەدی، ئەو پیاوەی کە لەم چیرۆکەدا دەورێکی ئەوتۆ ئەبینێ کە هەرگیز نەبووە و نابێتەوە، بە دووچاوی تییژی بێ وێنەیەوە، بە لەش و لارێکی هەتا بڵێی توکن، بەردێنێکی پڕی پەرش و بڵاوەوە بە چڕو چاوێکی چڵکنەوە لەناو سیپاڵێکی پیس و پۆخلا.

وا ڕاوەستاوە سەیری قوبەی شینی ئاسمان ئەکا، گلێنەی چاوەکانی کەسکن (سەوز)، بەڵام چۆن کەسکێ بەسەر خۆڵەمێشیدا ئەڕوانن، نەخێر لە زیو ئەچن ئیتر بە زەبری ئەو تیشکی ڕووناکیەی کە بەریان ئەکەوێ ڕەنگەکەیان ئەگۆڕێ.

لە هەموو شتێك سەیرتر بریسکەی چاوەکانی نیە کە ئەدرەوشێنەوە، بەڵکو سەیر لەوەدایە ئەتوانێ چاوەکانی گەورە بکاو دیسان بچوکیان کاتەوە، ئەمەش تەنها لە وزەی جۆرە پڵنگێکی زۆر دڕدایە کە ئەویش لەوپەڕی ڕۆژهەڵاتی مەنشوریادا نەبێ لە هیچ گۆشەیەکی تری جیهان دا نیەو ناژی.

لەم ڕاوەستانەیا کە ئەڵێی شێرە بەفرینەیە و لە شوێنی خۆی دا سەرما وشکی کردۆتەوە، ئەو دەرفەتەمان دەست ئەکەوێ کە پتر لێی وردبینەوە. ئەبینین چەتەوڵێکی زۆر بە قەڵافەتە، سنگێکی پانی پێوەیە، لەگەڵ دوو بازووی بادراوی ئەوتۆ ئەتووت ماسولکەکانی لە پۆڵا داڕێژراون، خۆ ئەوە باسی ناولەپی دەستی ناکرێ وەك دووگازی ئاسنی بن، هێندە هێزو توانایان تیا کۆبۆتەوە گەر شێر بەو دوو دەستەی بگرێ لەوانەیە چرکەی لێبڕێ، هەر وەك ئەم جوتیارە پاڵەوانە سیبیریە ئەو پەیکەرە دێرینە بێ، مەردمی ڕابردوو بۆ دروشمی سەرسەختی و هێز و توانای ئادەمیزاد لەو

چەقی ڕێگەیەدا دایان تاشی بێ.

لەبەر ئەوە هیچ جێی سەرسوڕمان نیە کە ئەم زرتە بۆزە دەسەڵاتێکی لەرادە بەدەری هەبێ لەو دەشت و دەرە دوورەی سیبیریادا، کە جوتیارە ساویلکەکانی لەو باوەڕەدان ئەم کابرایە یەکێکە لە پیاوانی خوا لەوانەی خاوەن کەرامەتن و توانایان بەسەر هەموو شتێکا ئەشکێ، زۆر جار ئەو ژنە نەخۆشانەی چاك ئەکردەوە کە پزیشك و حەکیمەکان بێزاربووبوون لە دەستیان، ئەویش بێ ماندووبوون، هەر بەچاو تێبڕینێکی کەم لە دەم و چاویان، یا بە خوێندنی چەند ویردو ئەفسونێ، هەر هێندەیان بەخۆ ئەزانی خەویان لێکەوتووە، وە گەلێ جار دەستی ناپاکی و گزی بۆ سەر نامووسیان درێژ ئەکرد لە کاتی نوستن و خەو لێکەوتنیان دا، جار جارە ئەم دەست درێژیيانەی بۆ ئەتکی ناموسی ئەو ئافرەتانە بەدەر ئەکەوت بۆ کەسوکاریان، بەڵام کێ قورەتی ئەوەی هەبوو شان بدا لەشانی ئەم دێوە نەگریسە، چونکە خەڵکی لە ئاستیا لە پەلوپۆ کەوتبوون، وە بەتەواوی ورەیان بەردابوو نەیان ئەوێرا قزە بکەن و لەڕوویا بوەستن.

ئەم زرتە بۆزە هەر لە گای بەلەسە و ئێستری شێت ئەچوو، وەیا لە ئەسپێکی سرکی کێوی پڕ گڕوتین لغاو لە دەمیا نەبێ بە ئارەزووی خۆی هەڵ ئەتیزێنێ.

ئایا ئەم سەرلەبەیانیە بۆ ئەم نەگریسە چی بە دەمەوەیە؟

## کۆنە برادەرێکی راسپۆتین

وا راسپۆتین لە ڕاوەستانەیدا نوقمی گێژاوی خەو بینینە بە قۆدگا و ئافرەتەوە لەپڕ لە دوورەوە ڕەشاییەکی لێ بەدەرکەوت لەناو بەفرەکەدا لەسەرخۆ ئەجولێتەوە، بەدەگمەن وا ڕێ ئەکەوێ کەسێك گوندا و گوند بکا لەو چلەی زستانەدا، بەڵکو بە پێچەوانە لەترسی سەرما و سۆڵە دەوڵەمەند و هەژار بەناچاری ئەخزێنە کونی ژووری زنجەکانیانەوە بۆ گەرم بوونەوە.

ورده ورده ڕەشاییەکە هەتا ئەهات نزیکتر ئەبووەوە تاکو بەتەواوی ئاشکرا بوو کە ئەو ئاوارەیە ملی ڕێی ماڵی راسپۆتینی گرتۆتەبەر، بۆیە راسپۆتین زۆر بە پەرۆشەوە حەزی ئەکرد بزانێ کێیە، کە زۆر لێی نزیك بووەوە، ناسیەوە، کە ئەمە گەدایەکە لەو سواڵکەرانەی بۆ دەست بڕین و درێژی دەرودەشت ئەدەنەبەر.

ئەم دەروێشە کەوڵێکی لەبەرایە تا سەریشی داپۆشیوە، تیسکەکانی بەسەر شان و ملیا وەك باڵی کەمتیار هاتبووە خوارەوە، ڕدێنە چڵکنە چرەکەی پڕ بوو لە کێچ، بەڵام جلوبەرگی لە پێستی مانگا دروست کرا بوو، ئەویش مەگەر هەر خوا بزانێ لەکوێ پەیدای کردووە، تەزبیحێکی داربەڕووی دەنك هەراشی بە دەستەوە بوو، کە دروشم و دەست مایەی خواناسی و نان پەیداکردن و دەست بڕینی بوو، هەروەها وێنەی دوو پیاو چاکی چارە گرانیشی بە بەرسنگی خۆیەوە هەڵواسی بوو، هەرچۆنێ بێ لەبەر چاوی جوتیارە خواناسە ساویلکەکان نەك هەر ناشرین نەبوون و بەس بەڵکو بە پێچەوانەوە بە نورانی ئەهاتنە پێش چاویان، کە بەتەواوی گەیشتە بەرەوە، دوو لەپی دەستی کردە شەیپور وە هەتا خوا هێزی پێدابوو نەڕانی!

– هۆ، خوا بتپارێزێ لالە کریکۆر.

راسپۆتین ئیتر گومانی نەما کە ئەمە (بەرنابا)ی کۆنە برادەری منالّیەتی، وا ئێستا بۆتە گەدا، بۆتە تۆبەکار، بۆتە پیاو.

زەردەخەنەیەکی خۆش بەختی لەسەر لێوەکانی راسپۆتین دروست بوو، چونکە راسپۆتین میوانداری گەدایانی لا خۆش بوو بەتایبەتی ئەگەر میوان (بەرنابا)ی کۆنە برادەریشی بێ.

ژیانی ئەم دەروێشە بە تەنها بۆخۆی چیرۆکێکی دوورو درێژە، ئەمە کاتی خۆی هەر لەم گوندە باخەوان بووە، پاشان شەیتان تەفرەی داوە هێندێ سەوزەمەنی وەك کەلەرم لە باغی کلّێسەی گوندەکەیان ئەدزێ، لەترسی ئەوەی نەك دووچاری سزا ببێ هەلّدێ و سەری خۆی هەلّدەگرێ، وا ئێستا تۆبەی کردووە و چۆتە ڕیزی گەدایانەوە.

(بەرنابا) پیشەی گەدایی گەلێ لەشان خۆش بوو، ئەگەر (گەدایی) بە پیشە بدەینە پێنوس، وە بۆیە ئەم ئیشەی بۆخۆی هەلّ بژاردبوو، چونکە ئەیتوانی بە ئازادی هەموو گێتی بداتە بەر و گەشت و گەڕانی خۆی بکا، وە ئەم ئیشەش بۆ پیاوی دەست و پێ سپی و تەمەلّ و تەوەزەل هەر چنگ ناکەوێ، جگە لەمە تامی هەلّخەلّەتاندنی ئەم و ئەو و دەست بڕی چوو بووە ژێر کلۆری دانیەوە، هەتا خۆشی هەلّ ئەخەلّەتان بەوەی پیاوی خوایە، وە لەم ڕووەوە هەتا ڕادەیەکی باش خەلّکی ڕێزیان لێئەگرت، وە بە ئارەزووی دلّی خۆی ئەلەوەڕا، بەلاّم وا ئێستا غەریبی ولاّتی کردۆتەوە، غەریبی ئەو شوێنەی تیا هاتۆتە جیهانەوە، بەتایبەتی غەریبی نیشتمان و شوێن و جێگای یاری کردنی سەردەمی مندالّی و بیرەوەری هاوڕێیەتی لەگەلّ راسپۆتین دا، کە بەیەك گەیشتن دەستیان کردە ملی یەك و زۆر بە گەرم و گوڕی لەسەر نەریتی ڕووسی ماچی ناودەمی یەکتریان کرد، هەناسەی بۆگەنی یەکتریان تێر تێر هەلّمژی، هەر لە هەمان کات دا ئەو گەلە کیچانەی لە بێشەی چڕی ڕدێنیانا لانە و مالّیان کردبوو تێکەلّ بە

یەکتر بوون.

راسپۆتین فەرمووی هاتنە ماڵەوەی لە دەروێش کرد، وەلەسەر چاکترین کورسی ماڵەوە دای نا، لەبەردەم مێزە گێرە گەورەکەدا، پارچە نانێکی رەق و لالویچە خوێیەکی پێشکەش بە دەروێش کرد ئەمە نیشانەی نان و نمەك کردنە، بەرناباش سوپاسی گەرم و گوڕی راسپۆتینی کردوو بەبێ شەرم و شکۆ وتی:

–لالە، کەشکۆڵەکەم ڤۆدگای تیا نەماوە، سەرماو سۆڵەی رێگا ناچاری کردم کە بەبێ پەروا هەڵی لووشم، هەتا بتوانم ئەو جەنگەڵە دوا براوە ببڕم، ئایا هێندێ ڤۆدگام پێشکەش ناکەی؟ راسپۆتین ئاهێکی هەڵکێشا لە دەرونێکی بۆکروزاوییەوە، پاشان وتی:

– خۆزگەم بۆم بلوایە، داخی گرانم!. بە گەورەیی خوا نازانم چۆن ئەم زستانە بەبێ ڤۆدگا بەسەر بەرم، سەرماو سۆڵەی زستان و شەوانی دوور و درێژی وای لێکردم بەبێ پەروا هەر بیخۆم و بیخۆمەوە هەتا چۆڕ بڕم کرد.

بەرنابا شانێکی بۆ هەڵتەکان و پێی وت:

– ئەگەر لەجێگای تۆ بوومایە ئەی لالە بەسەری تۆ قەسەم نەم ئەهێشت بێتە کزی. نیشانەی سەرسامی کەوتە چرو چاوی راسپۆتینەوە، بۆیە بە توندی قیڕاندی:

– ئەزێ ئەوە بەڕاستتە؟ ئادەی با بزانم چیت ئەکرد هەتا هەمیشە دەستت بکەوتایە؟ بەرنابا دەستی گرت و بە نەرمێکەوە پێی وت:

– ئەتەوێ پێت بڵێم ئەبوایە چی بکەی... دەسا توو گەورەیی خوا نۆرە بڕی لە قسەما مەکە، بە باشی گوێ لە ئامۆژگاریەکانم ڕاگرە تا قسەکانم تەواو ئەکەم.

کریکۆر، کەوتە بۆڵە بوڵ وەك نەیەوێ یا لای شەرم بێ گوێ لە

قسەکانی بگرێ لەگەڵ ئەوەش دا ناچار بوو وتی:

- چیت ئەوێ بڵێ....

ئیتر دەروێش چوار مەشقی لەسەر کورسی‌یەکەی ژێری دانیشت بەجۆرێ لە گاڵتە بچێتە دەرەوە، زۆر بە هێمنی لەسەرخۆ بۆ ئەوەی ئافرەت و منداڵەکان کە لە دەوروپشتیان دانیشتوون گوێیان لێ نەبێ وتی:

- ئا ئەو شەوە شومەت دێتەوە یاد کە حاکمی (تۆپۆڵست) قۆزاخی کردە سەرت، لەپاش گرتنت لە گۆڕەپانی ئەم گوندەدا بە ئاشکرا دارکاری کردی!!

راسپۆتین بە گرژبوونەوە وتی:

-مەبەستت لەمە چی‌یە؟

- کەمێ ئارامت بێ، ئەوە بوو پاش دارکاری بویتە تیزەجاڕی دانیشتووی گوندەکەمان، بە توانج و پلاری ئەم و ئەو هێرو حوڵ بوو بووی.

راسپۆتین لەمە پتر ئارامی نەگرت بە توندو تیژیەوە نەڕانی بەسەریا:

-ئایا بۆ ئەمە سەرت کردووە بە ماڵما هەتا گاڵتەم پێ بکەی و برینم بکولێنیتەوە؟

- لەسەرخۆ هەر ئەمەوێ ڕابردووت بەیاد بێنمەوە هەتا کەمێك هۆشت بێنمەوەبەر، چونکە نیازم وایە بیری خۆمت پێ بڵێم، لەبەرئەوە گوێم بۆ شل بکە کە هەتا دوا وشەم، ئەوسا چیم لێئەکەی قایلم.

راسپۆتین، بەناچاری دانی بەخۆیا گرت و وتی:

- چیت ئەوێ بەکورتی بڵێ.

- دارکاری کرایت چونکە بۆ چارەوێ دزین چوو بوویت، وە بۆیەکیش ئەمەت بیر ئەخەمەوە هەتا شەرمەزارت بکەم، خۆت ئەزانی ژیان گەلێ سەختە، مرۆڤ لە ژیانا هەتا مردن ئەبێ هەر پەلەقاژەی نان پەیداکردن بکا،

ئیتر چۆنی بۆ بلوێ و چۆنی بۆ هەڵسوڕا، بەڵام ئەوەی من سەرسام ئەکا ساویلکەیی تۆیە!.

– ساویلکەیی من؟ من ساویلکەم؟

– بەڵێ ساویلکەی، ئەوەندە ساویلکەی هەر لە منداڵ ئەچی... ئەو کەسەی هێز و توانای تۆی هەبێ هەرگیز قایل نابێ بەم بەشە کولەمەراگییەی تۆ تێدا ئەژیت ئەوەی هێزو توانای هەبێت چۆن قایل ئەبێ، بێتە دزێکی سووکی سەرشۆڕ دووچاری دارکاری و بەندی و ڕیسوایی ببێ، بۆیە ئەڵێم ئەبوایە تۆ جانەوەرێکی دڕی گەورە بویتایە، هیچ نەبوایە ڕێ گرێکی کەللە شەقی ئەوتۆ بوویتایە خەڵکی لە ترسانا ڕێزیان لێ بنایتایە، ئەوەندە دەوڵەمەند بویتایە کەس نەیوێرایە لە ئاستا بکۆکێ، تەنها لەم تاقە ڕێگەیەوە تۆ ئەگەیتە پایە و بەرزێتی، ئەگەر بتەوێ ئێستاش نەچووە بچێ، هەر بە چاو نوقانێ ئەتوانیت ببیتە سەردارێکی بەرز، یا شازادەیەکی تەواو، یا وەزیرێ، یا قەشەیەك لە قەشە گەورەکانی خوا!

هەر هێندەی دەروێش لە وتارە نایابەکەی بووەوە، کەمێك بێدەنگی کەوتە نێوانی هەردووکیانەوە، بەڵام راسپۆتین پەردەی ئەم بێدەنگییەی دڕاند بەوەی بە دەروێشی وت:

– ڕاست ئەفەرمووی برای شیرینم! هەرچی ئەڵێی دەق وایە، لێم مەگرە کە لە سەرەتای دووانەکەتا دەماری تووڕە بوون گرتمی! هەرچی ئەڵێی ئازادبە، خوا یاربێ بەوپەڕی دڵسۆزیەوە لەسەر ئامۆژگاریەکەت ئەڕۆم.

بەرنابا پێکەنی و بە راسپۆتینی وت:

– کەوا بوو لەسەر هەنگاوەکانم بڕۆ... وە ئێستاش هەڵسە با بە یەکەوە بچین بۆ کڵێسە.

– هەتا نوێژ بکەین؟

- نەخێر گەوجە! بۆ ئەوەی شوشەیەك ڤۆدگا پەیدا بکەین تینوێتی خۆمانی پێ بشکێنین! ئەگەر من بچمە دیدەنی قەشە پیرە دڵ نەرمەکان، دڵی بەزەیی پێم ئەسوتێ، هەر هیچ نەبێ شوشەیەك ڤۆدگامان پێشکەش ئەکا خۆمانی پێ ببوژێنینەوە!

راسپۆتین لەگەڵیا راست بووەوە و بە جووتە چونە دەرەوە.

## لە کڵێسە

بە دەم چوونیانەوە بۆ کڵێسە دەروێش بەرنابا سەرمەشقی راسپۆتینی دا ئەداو مژدەی سەرکەوتنی دواڕۆژی ئەخوێند بە گوێچکەیدا بەم جۆرە:

- کەسێك تین و توانای تۆی هەبووایە زۆر بە ئاسانی ئەگەیشتە گەورەترین پایە لە نیشتمانی پیرۆزمانا (ڕوسیا) وە باشترین هەنگاوێك بۆ تۆ ئەوەیە بچیتە ریزی پیاوانی ئاینیەوە.

راسپۆتین پێکەنی و وتی:

- دەستی ڕۆژگار بۆ قەشەیەتی ڕەهبانی قاڵی نەکردووم، قەشەیەتی ڕەهبانی لە سروشتی تایبەتی من ناوەشێتەوە.

- وەکو پێت ئەڵێم ئەبێ هەر بێیتە ریزی پیاوانی ئاینیەوە، واتە ببی بە قەشە! وە ئەوەی من پێت ئەڵێم ئەوە نیە خۆت برەنجێنی و شەونوخونی و جاویدانی بکەی، بەڵکو من پێت ئەڵێم دروشم و ڕوکەشی قەشەیی و ڕەهبانی هەڵبگرە، چونکە ساویلکە لە ئالاو والای سیپاڵی ڕەهبانی بەولاوە چاوی هیچی تر نابینێ، بەسەری تۆ قەسەم هەر کەمێکم لە هێز و توانای تۆ هەبووایە بە گەدایی قایل نەدەبووم، ئەگەر چی ئەم پیشەیەم ئەوەندەم خۆشی بەسەردا دائەبارێنێ کە بە ماندوو بونێکی زۆر لە فەرمان و ئیشێکی تر دا چنگم ناکەوێ، دەبا بار سوکی خەم بە بادانیشم لەولاوە ڕاوەستێ، کە لە کڵێسەیەکەوە ئەچم بۆ کڵێسەیەکی تر، لە پەرستگایەکی

خۆشی شارێکەوە ئەچم بۆ پەرستگای گوندێك، خۆ ئەگەر بڵێی ویرد و ئەفسوون خوێندنم خۆشم سەروبەری لێ دەرناکەم، لەگەڵ ئەوەش دا ئەوەندەم خێرو بەرەکەت بەسەرا دا ئەبارێ بەتایبەتی لەو هەژارانەوە کە خۆیان لە من زیاتر پێویستیان بەو خێرو بەراتانەیە!

– خواردن و تەمەڵی دوو بەهرەی جوانن، بەڵام گرنگترین شتێك بەلای منەوە یا بە واتایەکی ڕەواتر هیوای هەرە گەورەی من لە ژیان دا ئەوەیە کە هەموو ئافرەتانی جیهان بە تەنها هەر بۆخۆم بێت، مەگەر بەم چەشنە کفت و کۆی دڵم دامرکێتەوە، دەروێشێکی لاتی وەك تۆ لەوانەیە بتوانی بەزەیی ئافرەتێك بۆخۆت ڕاکێشی، بەڵام ناتوانی بە ئاسانی تەفرەیان بدەی بە دڵی خۆت گڕی ئارەزووت دامرکێنیتەوەو یا بیانخەیتە ژێر ڕکێفی خۆتەوە، چونکە پاڕانەوەی دەروێشێك هەرگیز ڕێگای لەخشتە بردن و دابڕینی دەسەڵات نیە، لام وایە سەرت لەم ڕاستیە دەر ئەچێت؟

– زۆر ڕاست ئەفەرمووی لالە کریکۆر، بەڵام نامەوێ تۆش دەروێشێك بی وەك من، بەڵکو قەشەیەك، ڕاهیبێکی باوەڕپێکراوی تەواو، ڕاهیبێکی بەرز، لەوانەی سەرپەرشتی باربۆکانی کڵێسەکانیان بەدەستەوەیە، ئەمەش وەك ئەزانی فەرمانێکە پایەو ڕێزی تایبەتی خۆی هەیە، بەزەیی ئافرەتان ناوروژێنی لەخۆت بەڵکو بەتەواوی دەرفەتی ئەوەت ئەبێ بیان خرۆشێنی و بیان خەیتە هەلەکە سەما پاشان بیانخەیتە ژێر ڕکێفی ئارەزووی خۆتەوە، بەم جۆرە جۆش و تەوژم و ئارەزووی لەڕادەبەدەرت دامرکێنیتەوە!

لێرەدا لچە ئەستورەکانی ڕاسپۆتین بۆ زەردەخەنەیەك داچەقی، نیشانەیەکی ڕاستەقینەی قایل بوونی بوو بەو پێشنیارە بەنرخ و بەجێیەی دەروێش بەرنابا!..

بەم جۆرە بە چەنە بازی و پاشان بە وید خوێندن خۆیان کرد بە

کڵێسەکەدا هەروا پەیتا پەیتا بەدەست چلیپایان لەسەر سنگیان دروست ئەکرد.

ئەم کلێسەیەش هەر وەك هەموو کلێسەکانی تری ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا بە ئـــاڵاو واڵای ئاوریشـــمی ڕازاوەتـــەوە، مۆمـــدان و ێنـــەی خواناســـە هەڵکەوتووەکان و شەهیدە ناودارەکان دیوارەکانی ڕازاندۆتەوە، ئەمانەش هێندێکیان لە زێڕو هێندێکی تریان لە زیو دروست کراون، وا پەیتا پەیتا هەر جوتیارە و مۆم یان قوتیلە لە قەشەی کلێسەکە ئەکڕن و پاشان دایان ئەگیرسێنن و ئەیبەن لەبەردەم وێنەیەکی لەو پیاو چاکانەی هەڵواسراوە دای ئەنێن، هەر جوتیارە لەبەردەم مۆمی خۆی دا ڕائەوەستێ تا پێش خزمەتی کلێسا مۆمەکەی ئەکوژێنێتەوە، هەتا جێگە بۆ مۆمی جوتیارێکی تر بکاتەوە، لە هەمان کاتیشا بۆ ئەوەی بەرماوەو خڵتەی ئەو مۆمە سوتاوانە بکاتەوە بە مۆمی تازەو سەر لەنوێ بە جوتیاری تر بیفرۆشێتەوە!

قەشەی ئەم کلێسەیە سەرو سیمای جوتیارانە هەڵکەوتووە، وە خۆشی هەر وەك جوتیارە ساویلکەکانی گوند باوەڕێکی کوێرانەی بە ئاین هەبوو، هەتا خوا حەز بکا نەفام و پیس و چڵکن بوو، دووچاوی ڕوونی خێلی پێوە بوو لەگەڵ دوو بڕۆی چڕی وەك چەتر بەسەر لوتێکی چەماوەدا هەڵدرا بوون.!!

سەرگۆنەی بە وێنەی دوو سێوی بچکۆلە دەرپەڕیبوون لەگەڵ دوو لچی ئەستوری وەك لێوارە کولێرە، بەڵام با بۆ خوا بڵێین پرچە درێژەکانی کە لەگەڵ ڕێشە پڕە درێژەکەیا تێکەڵ بوو، وای لە مرۆڤ ئەکرد کە چاو لە چارە گرانی و چڵکنی بپۆشن، تەقلەیەکی ڕەشی کۆنی لەسەر ناوبوو، چلیپایەکی (صەلیب) زیوی زنجیر داری بە سنگە پانەکەیدا شۆڕ کردبووەوە کە لەبەر ڕووناکی بڵێسەی مۆمەکان ئەبریسکایەوە،

کەوشەکانی لە باشە گران بەهاکان بوو، لەوانەی کە دەستی بەخشندەیی خێرەومەنـدان پێشکەشـیان کردبـوو، ئـەو دەوڵەمەندانـەی ئەیانـەوێ بـە خێرکردن لەخوا نزیك ببنەوە.

لەم کاتەدا کڵێسـەکە جمەی ئەهات بەو ژنـە جوتیارانـەی کەوشەکانیان دەق پێڵاوی پیاوانە بوو، لەترسی سەرما بە ناچاری لەپێیان کردبوو، بە دەم دوعـاو پاڕانـەوەوە لـەم مۆمدانـەوە ئەچـوون بـۆ ئـەو مۆمـدان، بـەبێ ماندوو بوون و وەڕس بوون، مناڵە چەپەڵەکانیان بوونەتـە کلکیـان دەست لە چمکی کراسی دایکەکانیان بەرنادەن و بە دەستێکیشیان هـەر خـەریکی سەرهەڵکڕاندنی خۆیانن.

لـە کـونجێکی ئـەم کڵێسـەیەدا سـێ پیـاوی نـەگریس بـە دەم هەنسـکی گریانـەوە پەشـیمانی دەر ئـەبڕن، تومـەز ئـەم سیانە ئەسـپێ لـە گیرفانیانـا سـەوزەڵە گیـانم ئـەڵێ، نیازیـان لـەم گریانـە ناکاتیـە ئـەوە بـوو، کـە بـەزەیی خێرخواهـان بـۆ خۆیـان ڕاکێشـن، هـەتا چـەند پـارەو پـولێ پەیداکـەن بـۆ کڕینی شەراب و قۆدگا بۆ گەڕانەوە سەر نـەریتی ساڵەهای ساڵی تەمـەنی بەبا چوویان.

دەروێـش بـەرنابا بـە هـای و هـوو پـەردەی کـش و مـاتی نـاو کڵێسـەکەی دڕاند و بە یەك کەفلە کون گەورەو بچوکی ناو کڵێسەکەی لە دەوری خـۆی کـۆ کـردەوە، زۆریشـی نەخایەنـد کـە دەرونـی بـەزەیی ژنـە جوتیارەکـانی هاتیـە جـۆش، بـە ڕاسـت و چـەپ دا دەسـت کـرا بـە پـارە فـڕێدان بـۆ دەروێـش، وا قەشـەی کڵێسـەکە بە مۆرێکـەوە سـەیری ئـەم کـەین و بەینـە ئەکا....

زۆری نەبرد کە قەشە دەروێش بەرنابای ناسیەوە بەوەی ئەمـە هـەر ئـەو جوتیارەیـە کـە ڕۆژێـك لـە ڕۆژان سـەوزەمەنی بـاغی کڵێسـەکەی دزی و لەترسـی سزادان سـەری خـۆی هـەڵگرت و هـەڵهات، وا ئێسـتا بـەبێ تـرس

کەشکۆڵی گەدایی هەڵ گرتووە و پارەو دراو لەم و لەو کۆ ئەکاتەوە، قەشە لەم کردەوەیەی دەروێش پەست بوو هەردوو چاوی پەڕینە تەوقی سەری، چونکە ئەم کارەی دەروێش دەستی داهاتی تەنها بە خۆی ڕەوا ئەبینێ لەم گوندەدا، وا ئێستا لێی بۆتە مێڵ.

راسپۆتین لە گۆشەیەکەوە ڕاوەستاوە سەرنج لەم کەین و بەینە ئەدا.

قەشە گەیشتە تینی ئیتر خۆی پێ ڕانەگیرا بەجۆرێکی تایبەتی دەستی لە دەروێش هەڵتەکان نیشانەی ئەوە بوو کە دەروێش دوای کەوێ، هەتا دووبەدوو گفت و گۆ بکەن بێ ئەوەی کەسێ گوێی لە وتووێژیانەوەبێ...

پێکهاتن!

دەروێش چاوی لە دەست هەڵتەکاندنەکەی قەشە بوو، دوای کەوت، بە یەکەوە چوونە ژوورێکەوە لەو ژوورانەی کە بۆ هەموو کەس نالوێ تیا دانیشێ، ئەم ژوورە پڕە لە کەلوپەلی بەهاداری کڵێسەکە، وەك مۆمدانی زیوی جەواهێربەند و بوخوردانی لە وانەی تەنها ڕۆژانی جەژن ئەهێنرێتە دەرەوە، یا ئەو کاتانەی دەوڵەمەندێك ئەمرێ و کەسوکاری پارەیەکی زۆر ئەدەن بۆ گێڕانی پرسە و خوێندن لەسەری و دانیشتن بۆی!

هەروەها چەند پێڵاوێك لە کونجێکەوە دانراوە لە کونجێکی تری ژوورەکەدا شوشەی ڤۆدگای کۆنی گەڕاوە لە بەرهەمی میوەکانی کڵێسە یا لە دەست و دیاری میوان و خێرخواکان کە ناوە ناوە پێشکەشی کڵێسەی ئەکەن ڕیزکراوە.

کە بە جووتە لە ژوورەکەدا یەکدگیر بوون، شیرانی بەڕووی بەرنابای نەگریس دا:

– چۆن وێرات ئەی نەگریس بگەڕێیتەوە ئێرە، لە کاتێك دا خەڵکی ئێرە هەموو ئەوناسن؟ بەرنابا خۆی لێ گەوج کرد و وتی:

– لێم ببورە ئەی باوکی دڵ نەرم، زۆر ڕەوایە خۆتم لێ تووڕە بکەی، من

پەشیمانم لە کردەوەکانی ڕابردووم، خوا یاربێ، وا بە دوو چاوی خۆت ئەمبینی کە خۆم کەمەندکێش کردووە بە زنجیر خۆم سزا ئەدەم، بەسەر ڕاستی ڕووم کردۆتە دەرگای میهرەبانی خوای گەورە، نوێژی بۆ ئەکەم تا لە گوناهەکانم خۆش بێ.

قەشە بە توڕە بوونەوە لێی ڕاپەڕی:

– مەومڕە (سروشتی خۆرسکی ئەگریسی وەك تۆ مەگەر یەزدانی گەورە بە موعجیزە بی گۆڕێ، تۆ ئێستا لەجاران ناپاکتر و بێ ئاین تری).

– میهرەبانی خواو بەزەیی خوا فراوان و بێ پایانە، توانای یەزدان لەسەروو هەموو هێز و توانایەکەوەیە، کەوابوو چۆن بەدووری ئەگری کە خوا موعجیزەیەکی نواندبێ بۆ گۆڕینی سروشتی خروسکی من، دڵنیابە کە وازم لەدزی هێناوە سواڵ و دەرۆزەش لەکەس ناکەم.

– ئەوە تۆ چی ئەفڵتێنی، ئەگەر دەرۆزەت بکردایە چاکتر بوو، وا تۆ بەبێ شەرم و شکۆ پیتاك و باربۆ کۆئەکەیتەوە لەو کەسانەی لەم گوندەدا سەر بەمنن، بەشی موچەی من داگیر ئەکەی بۆ خۆت وا منیش زەقەی چاوم دێ!

دەروێش کەوتە پێکەنین و کڕنوش بردن بۆ قەشە نیشانەی سەلماندنی ئەم ڕاستیە. لێرەدا قەشە وتی:

– ئەتەوێ زۆر لێرە بمێنیتەوە؟

– ئەوەی ڕاستی بێ ئەمە تەنها بەدەستی تۆیە!

قەشە بەمە واقی وڕما، بۆیە هەڵشاخا پیایا:

– من؟ وە چۆن؟

– ئەی باوکی بەڕێزم، ئەی باوکی پیرۆزم، ئەگەر بەمن بێ هەر ئێستا ملی ڕێ ئەگرم بەوەی ئەمەوێ بچمە تەواف و دیدەنی پەرستگای (ساراتۆف) کە زۆر دوورە لێرەوە، خەرجی ڕێگام نیە بە وردینە نازدارەت

قەسەم!

– چۆن من هەر ئێستا تۆم دی پارەی ئەم و ئەوت پەیتا پەیتا ئەئاخنیە گیرفانتەوە.

– ئەمە هەر هیچ نیە پارەیەکی کەمە هەر بەشی کڕینی هێندێ پێویستیم ئەکا ئەی خەرجی ڕێگا لە کوێ بێنم؟

– نەگریسیت گەیشتە ئەم ڕادەیە داوای خەرجی ڕێگا لەمن بکەی، لە منێك کە باربۆو پیتاك و یارمەتی کۆئەکەمەوە؟ بەخوا بابە ئەمە سەیرە! وا ئەزانی ئەوەی بۆ بێوەژن و هەژارانی ئەم گوندە کۆم کردۆتەوە هیچ ناکەم ئێستا ئەیدەم بە تۆی بێ ئابڕووی بێ شەرم!

لێرەدا شێوەی گفتوگۆی بەرنابا لە هێمنیەوە گۆڕا:

– ئەبێ لە دەمی خۆتی بگریتەوە بۆمن!

ئیتر قەشە وەك نیسك هەڵچوو دەستی کرد بە شیڕاندن بەڕووی بەرنابادا.

– تۆ دزێکی سەر شۆڕی بێ نرخی!... هەر ئێستا ئەبێ ئەم گوندە بەجێبهێڵی ئەگینا هەواڵی لاساریت ئەگەێنم بە سەرپەرشتانی کاروباری کڵێسەی پیرۆز، وە لەبەردەمی ئەوانا ئاوڕووتت ئەکەم بەوەی نەگریسیت هەتا چ ڕادەیەکە، وە لەژێر پەردەی خواناسی و ئاییندا چی ئەکەی!

بەرنابا شانێکی بۆ ئەم وشانەی قەشە هەڵتەکان نیشانەی دەربەست نەبوون، وە زۆر بە شێنەیی‌یەوە وتی:

– چیت لەدەست دێ درێغی مەکە!

قەشە لەم هێمنی و تێکنەچوونەی بەرنابا واقی وڕما بۆیە بە منجە منجێکەوە وتی:

– وا دیارە لەم هەڕەشەیەم ناترسی؟

– چونکە هەڕەشەیەکی بێ جێیە... دەروێش لێرەدا وای پیشان دا کە

ئەیەوێ بڕوا، بۆیە قەشە بەتەواوی پەشۆکا، وا هات بەیادیا کە بەرنابا پاڵپشتکی گەورەی هەیە لە پیاوانی گەورەی ئاینی، بۆیە نەیهێشت بڕوا، توند قۆڵی ڕاکێشا و وتی:

– لەسەرخۆ، لە تورەبوونم ببورە، وا هەر ئێستا هەرچیەکت پێویستە لە پارە پێشکەشتی ئەکەم، بەمەرجی دەست بەجێ لە گوندی (بۆکرۆنسکی) دەرچیت، وە جارێکی تر دڵت ختورەی گەڕانەوەی ئێرە نەکا.

لەگەڵ ئەم وشانەیدا دەستی کرد بە تورەکەی پارەکەیدا و کاغەزێکی سێ ڕۆبڵی دەرهێنا، بەرنابا بە گاڵتە پێکردنێکەوە لێی وەرگرت و پێی وت:

– ئا ئەمەیە هەموو بەخشندەگیت!

قەشە بەدەم هەناسەیەکی بۆکڕووزاویەوە وتی:

– خۆزگە دەستم بڕۆیشتایە پترم پارە پێشکەش بکردیتایە.

بەرنابا پەنجەی بۆ شوشە ڤۆدگاکان درێژ کردو وتی:

– ئەتوانیت هیچ نەبێ ئەوەندەم بدەیتێ کە تێر بخۆمەوە لە پێکی تەندروستیتان.

ئیتر نەوەستا گوێی لە وەڵامی قایل نەبوونیەوە بێ، خۆی دەستی درێژ کرد شوشەیەکی ڕاکێشا و نای بەسەریەوە، قەشە کە زۆر لێی پڕ بوو نەڕانی بەسەریا:

– هیچ شەرم ناکەی ئەی چاو برسی وا بەم جۆرە بەتەنها خۆت سەرخۆش ئەکەی؟

– فەرمایشتت زۆر بەجێیە ئەی باوکی گەورەم، ئەی سەرچاوەی دانایی و زانیاری و خواناسی! وا بە کردەوە ئەسەلمێنم کە هەتا چ ڕادەیەك لام بەڕێزی. ئامۆژگاریە بەنرخەکانت ئەخەمە سەر سەرم، وا هەر ئێستا ئەچم راسپۆتینی برادەرم گاز ئەکەم هەتا بە دوو قۆڵی پێکی تەندروستیت نۆش بکەین....

بەدەم ئەم قسانەوە بە گورجی چووە دەرەوە و راسپۆتینی لەگەڵ خۆی ڕاکێشا بۆ کونی ژورەوە، راسپۆتین خۆی پێشکەش بە قەشە کرد و وتی:

- ئەی باوکی خۆشەویست، سێ روبل و شوشەیەك ڤۆدگات پێشکەش بە برای خۆشەویستم بەرنابا کردووە؟

قەشە بە نابەدڵیەکەوە وتی:

- بەڵێ ئەی کوڕم .... بەڵام شوشە ڤۆدگاکەی بە فڕندن فڕاند.

- قەیناکە! ئەی گریمان منیش وەك بەرنابا، سەری خۆم هەڵئەگرم و لەم گوندە دەرچم، چیم ئەدەیتێ؟

- کەی؟ هەرئێستا؟

- بەڵێ هەر ئێستا.... قەشە بە دەنگێکی بەرز و لەقوڵایی دڵەوە وتی:

- هەرچیەکت پێویستە پێشکەشتی ئەکەم!

- خۆت ئەزانی چاوچنۆك نیم ئەی باوکی خۆشەویستم هیچم لە تۆ ناوێ، چەند کۆنە سیپاڵێکی قەشەیی خۆت نەبێ!

قەشە لەم قسانە واقی وڕما، بۆیە وتی:

- ئەم کۆنە جلانەی منت بۆ چیە؟

راسپۆتین دایە قاقای پێکەنین و وتی:

- ئایا لێم ناوەشێتەوە خۆم بکەم بە قەشەیەکی شارەزا، لەوانەی باربۆ و پیتاك کۆئەکەنەوە، هەتا خوا دەروویەکم لێ ئەکاتەوە، ئەو کاتە پیشەیەکی باشتر ئەدۆزمەوە؟!

پاش ئەم قسانەی چاوی بڕیە دوو چاوی قەشە بۆ چەند چرکەیەك چاوی لێ نە ئەتروکان، هەر وەك چۆن دوو لێویشی هەڵنەهێنایەوە بۆ قسە کردن، هەتا بەتەواوی لەژێر زەبری ئەم چاو تێبڕینەیا قەشە بەتەواوی پەشۆکا. کە لە شێوانی قەشە دڵنیابوو کەوتەوە قسە کردن و وتی:

- ئەبێ چەند نوسراوێکی ئەوتۆم بۆ دروست بکەی کە ئەوە بگەیەنن کە من کەشیشێکم لە کەشیشەکانی (دێری بۆکرۆنسکی پیرۆز).

– بەڵام کوڕم کوا لە ( بۆکرۆنسکی) دا هیچ دێر نیە!!

– زۆر چاك ئەزانم کە دێری تیا نیە، بەڵام من لەو باوەڕەدام کە زۆر ناخایەنێ لێرە دێرێك دروست ئەکرێ هەر بەم ناوەوە، خۆم ئەبمە گەورەی ڕاستەقینەی ئەو دێرە، ئەگەر خوا یاربێ و تەمەنت درێژکاو چەند ساڵێکی کەم بمێنی لە ژیانا بە دڵ لاف و گەزاف لێ ئەدەی بەوەی ئاشنا و ناسیاوی منی.

لە ڕاستیشا قەشە زۆر لە ڕاسپۆتین ئەسڵەمیەوە، چونکە بە شەیتانی ئەزانی لە وێنەی ئادەمیزاد دا، یا بەلای کەمیەوە سوێند خۆری شەیتانە، بۆیە هەر شاگەشکە بوو لەخۆشیانا بەوەی ڕاسپۆتین لە دێ دەرئەچێ، بۆیە بە ڕاسپۆتینی وت:

– هەر شتێکت داوا کردووە وا پێشکەشتی ئەکەم!

ڕاسپۆتین سەرلەنوێ دایەوە قاقای پێکەنین و دەستی ئەکێشا بە سەرشانی قەشەدا و وتی:

– هەرگیز ئەم چاکەیەتم لەبیر ناچێتەوە، لەگەڵ ئەم قسەیەی دا دەستی برد شوشە ڤۆدگاکەی نا بەسەریەوە...

پاشان جلوبەرگی قەشەیەتی تەقیلەیەك و چەند پەرتوکێکی ئاینی و شهادەت نامەیەکی ساختەی لە قەشە وەرگرت، ئا بەمانە کەرەسەی دەست بڕین و سەرمایەی فڕوفێڵی پێکەوەنا.

کە گەڕانەوە بۆ ماڵەوە نزیك بەدانیشتن بای ڤۆدگا لە کەللەی دابوون، دوو بە دوو بە چپە گفتوگۆیان ئەکرد، لەپڕ ڕاسپۆتین دەنگی هەڵبڕی گازی ژنەکەی، واتە ماکانیای کرد و پێی وت:

– بەیانی هەر شەوەکی لەگەڵ بەرنابای برادەرما ئەڕۆم بۆ گەشت، بەر لە دەرچوونمان لە ماڵ بە سەعاتێ چنگ سوتەیەکی گەرممان بۆ دەم بکە.

((ماکانیا)) هەر لە جێگای خۆی ڕاست بووەوە و بەدەم سەر خورانەوە وتی:

- زۆرت پێ ئەچێ ئەی کریکۆر؟

راسپۆتین بەدەم بۆڵە بۆڵەوە وتی:

- زۆرم پێ ئەچێ یا کەم بە ئارەزووی خۆمە، دە بڕۆ هەر ناگەڕێمەوە لاتان، هەتا چارەی گرانت جارێکی تر نەبینمەوە؟!

کە ماکانیا ئەمەی گوێ لێ بوو دایە پرمەی گریان و وتی:

- بەجێم ئەهێڵی ئەی کریکۆر؟

راسپۆتین دایە قاقای پێکەنین و وتی:

- بۆ ئەگریت؟ ئەگەر ئێستا بمردمایە، ئەبوایە خەرجی کفن و شاردنەوەم بکێشی! کەوابوو، بۆ سوپاسی خوا ناکەی، کە وەك مردوویەك خۆم ئەشارمەوە، بێ ئەوەی ئەو بارگرانی یە بخەمە ئەستۆی تۆ! بەخوا ڕاستە ئەڵێن ژن ئەقڵیان نیە لە خوا بپاڕێرەوە کە مانگایەك و ئەسپێك و بەرازێك و دوانزە مریشك و چوار منالم لەگەڵ شەش ژن لەو ژنە گیانیانەت (روحی) بۆ بەجێ ئەهێڵم کە ژیانت لەگەڵ بەرنە سەر، لەتەکتا فرمێسك هەڵرێژن بە دوای خۆشەویستی سەرهەڵگرتوودا.

هێشتا راسپۆتین لەم قسانەی نەبووبووەوە کە فینکە فینکی گریان لە ژنە گیانیەکانی راسپۆتین بڵند بووەوە ئەو شەش ژنەی ناومان بردن کە بریتین لەو ئافرەتە سوکانەی، بەبێ پەیوەندی ژن و مێردایەتی بە وێنەی ژنەکەی هەروەها لەگەڵ منداڵەکانیا بەیەکەوە هەموویان لەو شوێنەدا ئەژیان. ئەم ئافرەتانە کردیان بەشین و شەپۆر و هەنسك هەڵدان و بەدەم قوڵپی گریانەوە وتیان:

- بۆ کێمان بەجێئەهێڵی؟ وە ئێمە چۆن ئارام ئەگرین لەدوای تۆ؟

. لێرەدا دەروێش بەرنابا هەڵی دایە بۆ ڕزگارکردنی برادەرەکەی لەم تەنگ و چەڵەمەیە بۆیە وتی:

-کریکۆری برام بە کارێکی ئاینی پیرۆز هەڵئەسێ، ئێوە چۆن ڕێگەی لێ ئەگرن ئەی خوا نەناسینا؟

بەڵام جۆزیفا ئەم قسانەی دەروێشی بەگوێ ئاشنا بوو، وە لە هەموو ژنەکانی تر بە پەرۆشتر بوو، بۆ راسپۆتین، هەر هەڵسا و کەوت بەسەر دەست و پێی راسپۆتینا و پەیتا پەیتا پەنجەکانی دەت و پای ماچ ئەکرد و ئەی وت:

– لەگەڵ خۆتم بەرە، هەرچییەکت ئەوێ بۆت ئەکەم، هەرگیز دڵت نارەنجێنم، بێ دڵیت ناکەم، بە شەو و بە ڕۆژ کارەکەرێنیت ئەکەم بەوێنەی سەگێکی بەسفەت، چونکە هەرگیز ناتوانم بێ تۆ بژیم ئەی خۆشەویستەکەم، ناتوانم بێ تۆ تاقە شەوێك بەرمەسەر و ئارام بگرم!

ئیتر هەروا فرمێسکی گریانە بەکوڵەکەی بەسەر گۆنایا وەك ئاو جۆگەلەی ئەکرد، بەجۆرێ کاری کردە سەر دڵی سەختی لەبەرد داتاشراوی دەروێش بەرنابا، بۆیە وتی:

– لالە کریکۆر ڕێگای خواناسی گرتۆتە بەر، ئەبێ زۆر دوور بێ لە هەموو جۆرە پەیوەندیەکی ناپەسەند.

بەڵام (جۆزیفا) قسەکانی بە دەروێش بڕی وتی:

– من ئامادەم هەر دەست و پێکانی ماچ کەم ئێواران و بەیانیان!

ژنەکانی تر ئەم قسەیەیان لەدەم جۆزیفا قۆستەوە، وەك پێرێك بن لە ئاهەنگی مۆسیقا دا هەموو بەیەکەوە وتیان:

– ئێمەش ئامادەین بۆ ئەم دەست و پا ماچ کردنە!

لێرەدا راسپۆتین بە قینەوە وەك شریخەی بۆمبا تەقیەوە بەسەریانا:

– بێ دەنگ بن ئەی واوا لێکراوینە، من بە فەرمانی خوا ئەڕۆم بەرێگاوە، یەزدان دەست بە باڵمەوە ئەگرێ، ئێوەش ئا ئاوا لەگەڵم ئەجوڵێنەوە، هەی سۆزانینە!

بەدەم ئەم نەڕەیەوە پاڵێکی بە جۆزیفاوە نا و چاوێکی پڕ خەشم و قینی لەوانی تر زەق کردەوە، لەترسانا هەر یەکەیان لەجێی خۆیانا ژیر بوونەوە، تەنها جۆزیفا نەبێ کەلەی ئەپارایەوە و ئەی وت:

- لەگەڵ خۆتم بەرە هەتا پێش خزمەتیت بکەم!

ئیتر لە وزەی ئارامی راسپۆتینا نەما، هەر لە جێی خۆی ڕاست بووەوە و نەوی لە باڵی لە زەوی بەرزی کردەوەو توڕی دایە کۆلیتەکەوە، بە نەڕە نەڕ ئەی وت:

- بڕۆ مانگا بدۆشە و بێ دەنگ بە.

دوای ئەم کەین و بەینە راسپۆتین هاتە تەك بەرناباوە و دوو بە دوو دەستیان کردەوە بە چرپە چرپی خۆیان، بۆئەوەی ئەوانەی ژوورەکە لە هیچ تێنەگەن ، بە دەروێش بەرنابای وت:

- ئەرێ تۆ لەو باوەڕەدای کە دەروێشی لە من ئەوەشێتەوە، وە لە ڕێگاویان پێشوازیمان لێئەکرێ؟

بەرنابا لە وەڵامدا وتی:

- نیشتمانی پیرۆزمان (ڕوسیا) هەمیشە لانەی ئەو پیاو خراپانە بووە کە لە ژێر پەردەی ئاین دا ئیشیان کردووە، ئەو پیاوانەی لە جلوبەرگ و سیپاڵی پیاو چاکان دا خۆیان شاردۆتەوە.

راسپۆتین کەوتە بۆڵە بۆڵ و وتی:

- پیاو خراپ، دەست بڕ، ئەم قسە هیچ و پوچانە چیە ئەیکەیت، نابێ کەمێك شەرمت بەخۆبێ، نازانی ڕادەی هێزو توانام لە چ پلەیەك دایە؟

لەگەڵ ئەم قسانەیدا پەلی بەرنابای ڕاکێشا بەلای خۆیدا، هێندەی نەما بوو لوتیان لەیەك بدا، بۆ چەند چرکەیەك چاوە تیژەکانی بڕیە دووچاوی، دەروێش بەم کردەوەیەی راسپۆتین شپرزە بوو، چاوەکانی کەوتنە ڕەشکەو پێشکە لە جێی خۆیا خاو بووەوە لەژێر موگناتیسی چاوەکانی راسپۆتین دا هەروەك نوستووی لێهات بەمە ئینجا راسپۆتین وازی لێهێنا و پاڵێکی پێوەنا گەیاندیەوە جێگەی خۆی.

بەرنابا بە دەستەکانی چاوی خۆی هەڵ ئەگلۆفت، هەتا کەمێك هاتەوە سەر خۆی، پاشان پێی وت:

- بەڕاستی تۆ مامۆستایەکی لێوەشاوەی! ... لە ڕاستیشدا لە دڵەوە باوەڕی پێ هێنابوو، بەوەی هێزو توانای لە هەموو سەرێکەوە لە هێزو توانای مەردم بەدەرە، وە بەلای کەمیەوە دوور نیە پەیوەندی بە شەیتانەوە هەبێ لە هەمان کات دا بۆ بەرنابا دەرکەوت کە هیچ ئافرەتێ خۆی ڕاناگرێ لەبەر زەبری دەسەلاتی هێز و توانای موگناتیسی چاوەکانیا، لەبەرئەوە بەدڵ ئاواتی بەوە ئەخواست کە ئەمیش وەك ڕاسپۆتین خاوەنی ئەو دەسەلاتە گەورەیە بوایە کە هیچ شتێك خۆی لەبەرا ناگرێ!

بەرنابا سەرێکی لێراوەشاند و بە سوکێکەوە لە ڕاسپۆتینی پرسی:

- ئایا لەگەڵ شەیتان ئاشنایەتیت هەیە ئەی کاك کریکۆر؟

کەچی ڕاسپۆتین وەلامێکی ئەوتۆی نەدایەوە هیچی لێ تێبگا، بەڵکو دایە قاقای پێکەنینێکی سەیر، لەم کاتەدا سەرخۆشی بەرنابای کاس کردبوو هەر ئەوەندەی سەری خستە سەر مێزە گێڕەکەی بەردەمی خەو بردیەوە، بەلام ڕاسپۆتین بەدەم خواردنەوەوە بە دوورو درێژی بیرەوەری لە ڕۆژانی ڕابردووی ئەکردەوە هەتا ئەم کاتەی کە تیایا ئەژی، کە چۆن وا ئێستا بەرەو دواڕۆژێکی شاراوە ئەیەوێ هەنگاو هەڵگرێ، بەرەو چەسپاندنی دەسەلاتی لەڕادەبەدەری بەسەر سەرانسەری ڕوسیادا.

پاشان هەڵسا و بەرەو مۆمدانەکە کڕنوشێکی دوورو درێژی بۆ برد، کەوتە پاڕانەوە داوای پشتگیری لێکرد بۆ گەیشتن بە ئاواتی هەرە بەرزی....

**سەرەتای ڕێگا**

هێشتا جیهان تاریک و لێڵ بوو کە راسپۆتین و بەرنابای برادەری گوندەکەیان بەجێ هێشت، کەمێك ئەو دڵە ڕەقە بەزەیی بە هەنسك و فرمێسکی ئەو ئافرەت و منداڵانەدا نەهاتەوە کەوا لە ناکاو بەجێیان ئەهێڵێ، بەجووتە دەشت و دەریان گرتە بەر، کە پێیان بە بەفرە ڕەقەکەدا ئەنا، دەنگی قرچ و هوڕی بەفرەکە بەرز ئەبووەوە کە لەژێر گرانی لەشیان دا ورد و خاش ئەبوو. ئەستێرەکانیش لە ئاسمانی شین و بێگەرد دا جریوەیان ئەهات و ئەدرەوشانەوە، کزەبای ساردی ئەو دەرودەشتە هەر لە شوڵی تەڕ ئەچوو، دەستێکی بەهێزی شاراوە دای ئەوەشاندەوە بۆسەر لەشیان.

بە پەلە بوون هەتا زوو بگەنە دارستانە چڕەکەی بەردەمیان، بەڵکو ئەمە خوایە کەمێك خۆیان لە زەبرو زەندی دێوی شاراوەی با ڕزگار بکەن، ئەو کزە با ساردەی بە دارستانی ڕدێنیانا چلورەی بەفری شۆڕ کردۆتەوە!

کە مانگ ئاوا بوو تاپۆی دارە گەورە بەرزەکان و ئەو دارانەی هەورە تریشقە خستبوونی سامی ئەخستە دڵەوە، خۆ ڕێگاکەش هەتا بەرەو جەنگەڵەکە نزیك بێتەوە ناخۆشترە، بەوەی ڕێگاکە خوار و خێچ و لەشوێنێکا پان بوایە لە زۆر شوێنا ئەوەندە تەسك و باریك ئەبووەوە کە هەر نیشانەشی نەمێنێ، پیاو لەو شوێنانەدا دەنگی بە خوادا نەبێ بەکەس دا ناگات.

راسپۆتین لە ڕۆشتنەکەیدا سەری بەرزکردبووەوە، وەك لە ڕۆژی ڕووناك دا هەنگاو بنێ نەك لە شەوە زەنگی ڕەش و تاریکا، ئەمەش سەرسامی پێ ناوێ، چونکە چاوەکانی لەو تاریکییەدا وەك گڵۆپ داگیرسابوون، هەر لە چاوی دڕندە کێویەکانی ئەکرد!

لەپڕ راسپۆتین لەجێی خۆیا ڕاوەستا و پەلی بەرنابای ڕاکێشا و

چرپانی بە گوێیا:

- گوێ بگرە، شتێك وا بەدوومانەوە!!...

هەردووکیان وەستا بوون بۆ گوێ گرتن، هەتا ئەهات شکانی لقەکانی دارەکان کە لەژێر پێی ئەو شتەدا ئەشکا کە لێیان نزیك ئەبووەوە پتر ئەهاتە بەرگوێیان بەوەی هەر لێیان نزیکتر ئەبووەوە، دەرویش بەرنابا لەترسا کەوتە لەرزین چونکە هەرگیز بەبیریا نەئەهات کە ئادەمیزاد بوێرێ بەو جەنگەڵەدا بڕوا، لەو تاریکە شەوە ساردەدا، بۆیە ئیتر ئەو دەنگەی بەڕۆیشتنی گورگ، وە یا شتێکی وەك شەیتانی نەگریس ئەزانی، کە هەردووکیان یەك لە یەکتر پیاو تۆقێنەرترن لەم شوێنە چۆڵەدا!.

بەڵام راسپۆتین بە پێچەوانەی بەرناباوە بەبێ ترس هەردوو دەستی نابووە بن باخەڵی خۆی و لەسەرخۆ ورد ئەبووەوە، زۆری نەخایان تاپۆی ژنێکیان لێ بەدەرکەوت، تومەز ئەمە (جۆزیفا)ی ماڵ وێرانە سەری خۆی هەڵگرتووە، وێڵە بەدوای راسپۆتین دا.

ترس و سەرمای ئەو شەوە لەرزی لێهێنابوو، لەسەر بەفرەکە کەوت بەسەر پێڵاوەکانی راسپۆتین دا، کەوتە دەست ماچکردنی هەر وەك دوێنێ ئەلالایەوە و ئەی وت:

- لێم گەڕێ با دوات کەوم کەمێ بەزەییت بێ!

بەڵام راسپۆتین شانی بۆ ڕاتەکان و وتی:

- تۆ شێتی ئەی ( جۆزیفا) هەی قوڕت بەسەر هەر ئێستا ئەبێ بگەڕێیتەوە.

بەڵام (جۆزیفا) بە وێنەی سەگێ کە نەیەوێت لە خاوەنەکەی دابڕێ کەوتە خۆ تێهەڵسوون و منجە منج و وتی:

- چەند بەپەرۆشم بە دەستەکانت گیانم بکێشی!

- بەو ئاواتە ناگەی، پاشان چاوەکانی بڕیە دوو چاوی و وتی:

– هەر ئێستا یەکسەر ئەگەڕێیتەوە بۆ ماڵێ، ئەمەیە خواستی من، تێ گەیشتی؟

ئیتر جۆزیفا ڕاست بووەوە، بەوێنەی خەوتوو بەرەو دووا کشایەوە ڕاسپۆتینیش هەروا هەڕەشەی لێ ئەکا، بەم جۆرە:

– بگەڕێرەوە، بە نەفرەت ئەبی ئەگەر لێم یاخی ببی!

جۆزیفا بەبێ دەنگی پشتاوپشت گەڕایەوە، بەڵام وەك خەواڵوو خۆی دا لە لقە دارێکی کەوتوو، بەسەر تەوقەسەرا بەربووەوە بۆ بان بەفرەکە و چرکەی لێ بڕا. هەر وەکو گیانی تیا نەمابێ!

ئیتر ڕاسپۆتین بەدڵ خۆشییەوە ملی ڕێگای گرتەوە بەر بێ ئەوەی هەر ئاوڕیشی لێ بداتەوە.

دەروێش بەرنابا بەمە ئەوەندەی تر ڕێزی لە ڕاسپۆتین نا، بۆیە بە سەرپامیەوە وتی:

– بەڕاستی لالە کریکۆر دەسەڵاتت بەسەر ژنا بێ وێنەیە.

کەچی ڕاسپۆتین بە چاك و بەخراپ ورتەی لەدەم دەرنەچوو.

بەر لەوەی ڕۆژ گزنگ بدا، تیشکی سوری ڕۆژ دووبارە ئەبووەوە بەسەر ئەو بەفرە سپی یەدا کە بۆتە ئاوێنەیەکی گەورە، ئەوەی بۆ یەکەم جار لە ژیانی دا ئەو جۆرە دیمەنە ببینێ وا ئەزانێ ئاگر بەربۆتەوە لە دارستانەکەدا.

بەڵام دوو ڕێبوارەکە خۆیان بەم شتانەوە ماندوو نەکرد، زۆری نەخایان هاوڕێیەکی کەیان لێ پەیدا بوو، هاوڕێی ئەم جارەیان گورگێکی گەورە بوو لەوانەی دەشت و دەری سیبیریا، دوور بە دوور شوێن پێی هەڵئەگرتن، هەر ئاوڕیان لێبدایەوە، یا ڕاوەستانایە ئەکەوتە گورگە لۆقە و لە دوورەوە لەسەر پاشوی ڕائەوەستا سەیری ئەکردن، لەم کاتەدا بیرێ بە مێشکی ڕاسپۆتین دا هات و خستیە پێکەنین بۆیە بە بەرنابای وت:

– ئەمیش (جۆزیفا)یەکی ترە لەکۆڵمان نابێتەوە!

بەڵام دەروێش بە دەردی خۆیەوە گرفتار بوو، سەرو دڵی ئەوەی نەبوو مانای ئەم قسە خۆشە گەپاوییە تێ بگا، بەڵام ئەسەش پتر بەرنابای سەرسام کردبوو کە هەتا چ رادەیەك راسپۆتین نەترس و بێ باکە!

دەمەو ئێوارە گەیشتنە گوندێك لە هەموو سەرێکەوە هەر لە گوندی (بۆکرۆنسکی) ئەکرد، بە کڵێسەو گومەزە کەسکەکانیا بە زنج و خانووبەرەکانیا، لێرەدا دەروێش وتی:

– قەشەی ئەم گوندە برادەرمە و ڤودگای باشیشی هەیە، کە لە دەرگای کڵێسەیان دا، ژنێکی چاو بەگریان لێی کردنەوە کە ژنە ئەمانی دی لە جلوبەرگی ئاینی دان لە خۆشیان دا هەر شاگەشکە بوو بۆیە وتی:

– سوپاسی بێ پایان بۆ خوا کەوا گەیشتن بۆ نوێژکردن لەسەر تەرمی قەشەمان هەتا بەر لە مردنی دوا قسەی لێ وەرگرن!

راسپۆتین وەڵامی دایەوەو بە دڵێکی خۆشەوە بۆ ئەم رێکەوتە سەیرە، وتی:

– ئێمەش هەر بۆ ئەم کارە خێرە هاتووین ئەی ئافرەت!

پاشان چوونە خزمەتی هاو پیشەکەیان کەوا لەگەڵیان دا بوو هەتا دوا قسەی وەرگرن و ویردی بەسەرا بخوێنن!

ماتەمینی و پەژارە ژنەکەی داگیر کرد چونکە وا هات بە بیریا کە قەشە ئەبێ لەپیاوچاکان بێ بۆیە وا خوا دوو زرتە بۆزی بۆ نازڵ کردو بۆی نارد لە دوا ساتەکانی سەرەمەرگیا.

بەرنابا ئافرەتەکەی بانگ کردە لاوەو چرپانی بە گوێ یا:

–بچۆ شیوێکی نایابمان بۆ دروست بکە.

پیرەژنە کڕنوشێکی بردو بە چمکێکی شاڵەکەی چاوی خۆی سڕی و چوو چێشت دروست بکا بۆ نمایندەی خوا کە لەم کاتی چاو لێك نانی

قەشەیەدا بە هاواریەوە هاتوون! دیسان بەرنابا بەچپە بە ژنەی وت:

- کچم قۆدگا لەبیر نەکەی!!

## گەشت و گەڕان

مانگێکی ڕەبەق راسپۆتین و برادەرەکەی هەموو دەروەدەشت و ئاوایی‌یەکانی سیبیریایان تەی کرد، ڕوویان لە هەر شوێنێك بکردایە پێشوازییان لێ ئەکرا و پارەیان وەك تەرزە بەسەرا دائەباری لەلایەن جوتیارە هەژارەکانەوە.

راسپۆتین لەم گەشت و گەڕانەدا شارەزاییەکی بێ پایانی پەیدا کرد بە تەواوی کردەوەی (کەشیشێکی) شارەزای لاسایی ئەکردەوە، هەتا وردترین کەسێك نەی ئەتوانی ناراستی و کەلەك و فڕوفێڵی دەربخا، هەڵسان و دانیشتنی لە هی قەشەیەکی تەواوی ئەکرد، بەتایبەتی لە کێشانی چلیپادا لەسەر سنگی، لەگەڵ ویرد خوێندن و کوف کردنی بەسەر تۆبەکارەکان دا، لەگەڵ ئاخ هەڵکێشانی بۆ بێ نەوایان و داماوان بۆ هەموو ئادەمیزادە بێ دەسەڵاتەکان!

شێوەی گفتوگۆشی وەك جاری جاران نەماوە بەتەواوی گۆڕاوە، کە دەم با ئەدا بۆ قسەکردن هەمووی بە ئایاتی تەورات و ئینجیل ئەیرازێنێتەوە و پڕیشە لە قسەی نەستەق و بەڕێ و جێی پیاوچاکان و پیا هەڵخۆندن بە مریمی (عەزرا)دا و تیشکی چاوەکانی کاریگەرترە لە جاران.

ئەوانەی گفتوگۆی لەگەڵ ئەکەن وا هەست بە خۆیان ئەکەن کەوا ئاوەرووت کراون لە بەردەم ئەم جانەوەرە پیرۆزەدا! کە چاوی هەموو پەردەیەك ئەسمێ هەرچەند ئەستوریش بێ، هەتا بە ئاسانی هەستی مێشك و دڵ و دەروونیان وەك نوسین بە خوێندن ئەخوێنێتەوە! سیپاڵی پینەکراو و چڵکنی بەری باوەڕی خەڵکی وەك موگناتیس ڕائەکێشا، ئای کە چەند پیس و پۆخڵی لە پەرستن و جاویدانی‌یەوە نزیکە لەلای نەزان و

نەفام!

بۆیە هیچ سەیر نیە بەم سەرو گوێلاکەوە ڕێزی دەسەلاتی لە برەودابێ لای جوتیارەکان!

ئەوەی ئەم سەرکەوتنانەی راسپۆتینی لە دڵ و دەروونی خەڵك دا چەسپ تر ئەکرد کردەوە سەیرەکانی بەرنابا بوو کە بە زنجیر ئەهاتە وێزەی خۆی و حاڵی لە خۆی ئەهێنا، بەو نیازەی پتر هەست و هۆشی خەڵکی بۆ خۆی ڕاکێشێ، پاشان دەسی ئەکرد بە هەڵ خوێندن بەشان و باهووی کەرامات و رادەی لەخوا ترسی راسپۆتینا.

هەتا وەك پووره هەنگ ئەی ورووژاندن و لە دەوری راسپۆتینی کۆ ئەکردنەوە بۆ تۆبە کردن و خۆ پاك کردنەوە لە زەریای پر بەرەکەتیا!

راسپۆتین زۆر بە پەرۆشەوە توانای هێزی موگناتیسی چاوەکانی بەکارئەهێنا، بۆ ئەمەش ئەو ژنە لەخواترس و نەخۆشانەی هەڵئەبژارد کە مێشکیان شڵەقابوو، دەماری شێتیان بە ئاشکرا دیاربوو، وای ئەبردە مێشکیانەوە کە چاك بوونەتەوە لە نەخۆشیەکانیان، ئەیکردنە داردەستی خۆی بۆ بڵاوکردنەوەی کەرامەت و هێزی دەسەلاتی لەرادەبەدەری!

هەواڵی ئەم کەرامەتانەی لەگەڵ کاروانچیان دا بە هەموو لایەکا پەرش و بڵاوبووەوە، ئای چەند زوو کارەساتی لە توانابەدەر و سەیر بڵاوئەبێتەوە؟! دەرودەشتی دوور و درێژی بێ پایانی ئەبڕی وەك بروسکە هەتا وای لێهات موعجیزەکانی ئەم قەشە درۆزنە ویردی زمانی هەموو خەڵکی ئەو ناوچەیە بوو، ڕووی لە هەر شوێنێك بکردایە ناوبانگی بەر لە خۆی ئەو ناوەی پڕ ئەکرد، ئەگەر بەرەو نیمچە شارەکان بچووایە ئەوبینی خەڵکی کۆ ئەبوونەوە بۆ پێشوازی کردنی وەك چۆن پێشوازی لە ڕزگارکەرێ یا خواناسێکی گەورە و بەناوبانگ ئەکرێ، ژنان چمکی داوێنی کراسە پیسەکەیان ماچ ئەکرد و جوتیارەکان بەسەری ڕووتەوە

کڕنوشیان بۆ ئەبرد، وێنەی چلیپایان لەسەر سنگیان ئەکێشا بەوپەڕی ملکەچیەوە، وەك لە بەردەمی مۆمدانێکی پیرۆزی پاشماوەی پیاوچاکێ لە خواناسە پیرۆزەکانا بن!

ئێوارەیەکیان لەگەڵ برادەرەکەی، واتە وەزیری پڕوپاگەندەی، لالە بەرنابا گەیشتنە ئێستگەی ((ئۆمسك)) لەسەر ئەو هێڵی ئاسنەی بە سیبیریادا تێ ئەپەڕی و چیاکانی ئەبڕی بۆ ناو ڕوسیای ئەورووپی.

ڕێگای ئاسنی ئەو سەردەمە بایەخێکی تایبەتی هەبوو لە وڵاتان دا، ئێستگەی ئۆمسك هەر بەو پێیە شوێنێکی بایەخدار بوو، دالانێکی فراوانی هەبوو ئەو دالانە هەموو شتێك بوو، گۆڕەپان بوو (مەیدان) چێتیخانە بوو مەیخانە و بازاڕی گشتی و ئوتێل و چێشتخانەو کلێسە و شوێنی خواناسیش بوو!

لە ناوەڕاستی ئەو دالانەدا سۆپەیەکی گەورە هەبوو دووکەڵ کێشەکەی گەیشتبووە بنمیچەکەی، دەستەیەك بازرگانی بچوك لەدەوری دانیشتبوون دەمەتەقێیان ئەکرد لە ئیش و کاری بازرگانێتی و باس و خواسی بازاڕ و گۆڕانی نرخی شتومەك و لەدەنگ و باسی وڵاتانی دراوسێشیان ئەدووان، لە گۆشەکانی تری ئەو دالانەدا هەندێ جوتیاری هەژار (موچیك) لە پرخەی خەوی شیرین دا بەختەوەربوون بەو گەرم بوونەوەی بەخۆڕایی لەم شوێنەدا چنگیان ئەکەوت، بەڵام بۆنی ئارەقی لەشیان و بۆنی ئەو پێستە هەرزانانەی جلوبەرگیانی لێ دروست کرابوو پیاوی کاس ئەکرد، لەگەڵ ئەوەشا هێندەی نە ئەخایاند مرۆڤ لێی ڕائەهات.

لەوپەڕی دالانەکەدا بەرانبەر دەرگای دالانەکە مێزێکی درێژ بە پانی دیوارەکە هەیە، هەموو چەشنە خۆراکێکی لەسەر ڕیزکراوە، بەخۆڕایی ئەدرێ بەو کەسانەی داوای تەنها پێکی (ڤۆدگا) یا (زبرۆکا) یا (کەرمڵ) ئەکا ئەمانەش هەمووی شەراب و خواردنەوەی بەناوبانگن لە دانەوێڵە و

میوه دەرئەهێنرێن.

هەر لەسەر ئەم تەخت و خوانە، چای گەرمیش ئەفرۆشرێت، هەڵمی گەرمی لێ بڵند ئەبێتەوە لەو سەرمای زستانە سەختەدا، وردە پارچە لیمۆی بەسەرەوەیە، کە لیمۆ لەو شوێنانەدا میوەیەکە بەدەگمەن ئەبینرێ و دەست کەوتنی زۆر گرانە.

هەر لەسەر ئەو مێزە گەورەیە مۆمدانێکی گەورە هەڵواسراوە لەژێریا چرایەکی شوشەیی ڕەنگاو ڕەنگ دانراوە، ئیتر وا هەمە چەشنە و هەمەچیزە خەڵك ئەبینی دێن و دەچن، لەوانەی ئەخۆنەوە یا ورگ تێر ئەکەن، هێندێکیشیان سەرخۆشن یا بەچۆکا دێن لەبەردەم مۆمدانەکە، بە ملکەچیەکی ڕاستەوە، پەیتا پەیتا بەدەست چلیپایان لەسەر سنگیان دروست ئەکەن و ئەی کێشن و ئەی کێشنەوە.

هەتا چینە بەرزەکان و شلەشاریەکانی دانیشتوی شارەکانی نزیك ئەم ئێستگەیە لایان کەمی و سوکی نیە بێن هێندێ لەکاتی خۆیان لەم شوێنە سەیرەدا بەسەر بەرن، بۆیە وا ئەبینین ئەفسەری شۆخ و شەنگ خۆیان لە پاڵتۆ خۆڵەمێشیەکانیان هەڵکێشاوە دێنە دالانەکەوە بە شمشێرە درێژەکانیان بە چەکمە قورسە سوپایی‌یەکانیانەوە کە ئەبێتە هۆی سەرنج ڕاکێشانی خەڵکی!

ژنە جوانە شاریەکانیش ئەو جلوبەرگانەیان پۆشیوە کە لە تازەترین مۆدەی پاریس ئەچن .... قۆڵیان کردووە بە قۆڵی ئەو ئەفسەرانەدا، ژنە جوتیارەکانیش کە لە گۆشەکانی دالانەکەدا چیچکەیان کردووە بەچاوی پڕ لە خەشم و قینەوە هەروەها بە سەرسامیەوە لێیان مۆڕ ئەبنەوە!

بەتایبەتی ئەم ئێوارەیە ئێستگە جمەی دێ لە خەڵك دا ئەویش لەبەرئەوەی، شەمەندەفەری سیبیریا کە هەفتەی جارێك لێرەوە تێئەپەڕێ وا بەڕێکەوت ئەم شەو ئەگاتە ئێستگەی (ئۆمسك) ئەمەش ڕابواردنێکی

گەورەیە لەم هەرێمەدا کە لە هەموو شتێکی سەیرەوە تەریکە، لەهەمان کاتیش دا هەلێکە بۆ بینینی ئەو شەمەندەفەرە جیهانییە نایابەی بۆنی خۆشی ئەو گوڵە جوانەی پێوەیە کە پێی ئەوترێ شارستانێتی ڕۆژئاوا!

هەر کە شەمەندەفەرەکە ئەگاتە ئێستگە و ڕائەوەستێ هەموو خەڵکەکەش لەبان شۆستەی ئێستگەکە کۆئەبنەوە، جوتیارەکان بەجارێك سەیری ئەورووپییەکان ئەکەن، بەچاوێك وەك ئەمانە جۆرە گیانلەبەرێکی تری لە ئادەمیزاد بەرەو ژورترین. بەڵام ئەفسەرو دۆستە جوانەکانیان لەو جلوبەرگە مۆدانە وردئەبنەوە کە ئەورووپییەکان لەبەریان کردووە، هەتا ئەوانیش بنێرن بۆیان بێ لە کۆگای جلوبەرگە بەناوبانگەکانی پاریسەوە لەو شارەی کە بەشی هەرە زۆریان ناتوانن بیبینن مەگەر بەخەو!

ئەوەی هەرە دەوڵەمەمەندەکان لە جوتیارەکان و بەشەکانی تر جیا ئەکردەوە هەر ئەوەبوو ئەمان لەناو خۆیان دا بە فەرەنسی گفتوگۆ ئەکەن،خوا هەڵناگرێ بە زمانێکی ڕێك و پاراوی نەرم و ڕەوان ئەدوێن، ئای کە پیاوانی چینی بەرز چەند خۆیان بە بەختەوەر ئەزانن ئەگەر دەرفەتیان دەست کەوێ بۆ تێکەڵ بوون بەو بێگانانەی کە لە شەمەندەفەرەکە دائەبەزن بۆ خواردن و خواردنەوە، هەتا بتوانن کەمێ بە فەرەنسی یا ئەڵمانی بیان دوێنن هەتا زاخاوی مێشك و بیرەوەری ڕۆژانی ڕاردوویان لە پاریس و لەندەن و نیس تازەکەنەوە، نیس ئەو شوێنە دڵرفێنەی کە ئاو و بای پێچەوانەی ئاو بای تۆقێنەری سیبیریایە، نیس ئەو شارەی باخ و باخاتی پڕ لە گوڵی گەش و بۆن خۆشە و ئافرەتی ئەڵێی دانەی مروارین، ئەمە جگە لە ڕابواردنی گازینۆی (مۆنت کارلۆ) بەمە هیچ نەبێ بۆ چەند دەقیقەیەك ئەوەیان لەبیر ئەچێتەوە لە سیبیریا ئەژین، کەوابوو ئەم ڕابواردنە ئەو ماندووبوونە ئەهێنێ کێشاویانە، کە بەلای کەمیەوە هێ نەبێ گالیسکەکانیان ساز کردووە لە گوندە

دوورەكانیانەوە لەژێر ئەو كلورە بەفرانەی لە ئاسمانەوە دێنە خوارەوە، دووری شوێنەكانیان ئا لێرەوە دوو كاتژمێری تەواو ئەخایێنێ بەسواری!

هەر بە ڕێكەوت ئەو ئێوارەیەی راسپۆتین و بەرنابا تەشریفیان هێنا هەر ئەو شەوە شەمەندەفەرەكە ئەگەیشتە ئەم ئێستگەیە، هاتنیان سەرنجی خەڵكەكەی ڕاكێشا، بەلآم ئەمانە خۆیان لەكەس نەگەیان، یەكسەر ڕوویان كردە مێزی خواردنەوە، بەر لە هەموو شتێك لەبەردەم مۆمدانە گەورەكەدا بەچۆكا هاتن بۆ كڕنوش بردن، وەك ئەو پیاوە ئاینیانەی ناوبانگیان دەركردووە، دوای ئەو چاوڕاوە، بێ شەرمانە داوای دوو شوشە ڤۆدگای نایابیان كرد، وە هەر بە دەم چاوەڕوانی هاتنی ڤۆدگاكەوە دەستیان كرد بە مەزە و چەرەس خواردن لەو خۆراكە بەتامانەی ئارەزوویان ئەكرد، وەك (زاكۆزكی) و (كافیار)ی تازە كە راسپۆتین زۆر حەزی لێئەكرد.

خاوەنەكەی پیاوێكی سەروزمان شیرین و ڕووخۆش بوو، بە دەرفەتی زانی خۆی بنوێنێ بەوەی كەوا خواناسە و پیاوانی ئاینی خۆشئەوێ، بۆیە قایل نەبوو پارەیان لێوەربگرێ لە نرخی خواردن و خواردنەوەیان.

چەند ئافرەتێكی ناسك و نازدار لەم دوو پیاوچاكە نزیك بوونەوە، داوای كەرامەت و موعجیزەی تازەیان لە راسپۆتین ئەكرد، لەو موعجیزانەی ناوبانگی هەموو لایەكی داگیر كردبوو، بەلآم راسپۆتین سەرو دڵی خۆش نەبوو، جگە لەمەی خوی دابووە سەر خواردنەوەی شەرابی نایاب كە زۆر حەزی لێئەكرد، چونكە ئەم دەرفەتە نابێ لەچنگ دەركا بێ ئەوەی تێر و پڕ لە ڤۆدگا بخواتەوە ئەمە لە كاتێكا ناشیەوێ سەری خۆی گێژكا بە ویردی خوێندنەوە! پاشان بۆچی ئەو ئافرەتانە بدوێنێ لە كاتێك دا نیازی مانەوەی نیە، وە لە دڵ خۆشكردنیان هیچی پێ نابڕێ؟

ئا لەم كاتەدا بوو كە شەمەندەفەری چاوەڕێ كراو گەیشت، بەرنابا و

راسپۆتین لەگەڵ خەڵکەکە چوونە سەر شۆستەی ئێستگەکە و تێکەڵ بە خەڵکەکە بوون، بەجووتە چاویان بڕی بووە ئەو واگۆنە زلەی بە چراخان ڕووناك کراوەتەوە و ماڵەماڵە لە خواردن سواربووەکان تیایا لەسەرخۆ نانیان ئەخوارد، شوشە شەرابە نایابەکانیان لەبەر دەمیان دا ڕیزکراوە، راسپۆتین ئارامی لەبەر هەڵگیرا، بڕیاری دا کە خۆیان بگەیێننە ئەوێ، هەتا نزیك ببنەوە لە و ئافرەتە ئەورووپیانەی کە لە جوانیا وەك فریشتەن لەچاو ئافرەتەکانی سیبیریای چۆڵ و هۆڵا.

زەنگی یەکەمی شەمەندەفەرەکە لێی دا نیشانەی نزیك بوونەوەی بزوتنی هەتا سواربووکانی بکەونە خۆیان، پاشان ئێستگەکەش دوو لێدانی تری بۆ لێدان نیشانەی ئەوەی کە تەنها سێ دەقیقەی ماوە بۆ ڕۆیشتن، دوای ئەوە سێ لێدانی تریشی لێدا، پاش ئەمانە فیتە لە شەمەندەفەرەکە بەرزبووەوە ......

خەڵکەکە سەرسام بوون لەوەی راسپۆتین پاڵ بە برادەرەکەیەوە ئەنێ وەك گوێرەکەیەکی گەورەی دابێتە بەرخۆی بە جووتە خۆیان هەڵدایە ناو شەمەندەفەرەکەوە کە هێشتا لەسەرخۆ ئەڕۆیشت، هێندەی نەخایاند شەمەندەفەرەکە لەچاو ون بوو، لەناو تاریکی شەوا، ئەو شەمەندەفەرەی قەشەی خاوەن موعجیزەی هەڵگرتووە، لە سیبیریا دووری ئەخاتەوە!

لە ڕاستیش دا راسپۆتین بێزاربوو لە گەشت و گەڕان بە دێهاتەکانی سیبیریادا کە هەمووی لەیەك ئەچوون، پاش ئەوەی لە پیشەی قەشەیەتی دا قاڵ بوو بوو، بەخۆیا ڕا ئەپەرموو کە بتوانێ توانای خۆی لە شتێکی بەکەڵکتر دا بەختکا....

لە واگۆنی نوستنا!

هەر ئەوەندەی پشکنێری (مفتش). واگۆنی نوستن- کەلاوێکی بەلچیکی بوو- چاوی بەم دوو سواربووە ئاوارەیە کەوت بەزمانی خۆی دەنگێکی لێ بەرزبووەوە:

- خوا بەرەحمەتی خۆت! ئەبێ ئەم دوو دابەستەیە دەرکەم.

پاشان لێیان نزیك بووەوە بە زمانێکی شیرین و بە ڕوسی لێی پرسین، بەرنابا -کە هێشتا خومار بوو- لێی بەزمان هات و لەپاش ئەوەی بەسەرو گوێلاکی خواناسی خۆی و راسپۆتینا هاتە خوارێ وتی:

- ئەبینی ئێمە لەو بەشەین کە هیچ نادەین، چونکە پیشەمان هەر وەرگرتن و کۆکردنەوەیە، خوا بەو ڕۆژەنەکا شتێك لەئێمە هەلوەرێ.

لە هەمان کات دا راسپۆتین چاوی خۆی داگیرسان و بڕیە دووچاوی پشکنێرەکە بەنیازی خەو لێخستنی، بەلام ڕۆڵەی نەبەردی برۆکسل لەو بابەتە نەبوو بەکەڵکی نوستنی موگناتیسی بێ، بێ سود بوو کەمێك کاری تێنەکرد، ئەوەبوو ئەویش هەر لێیان ورد ئەبووەوە هەتا دەمی هەڵهێنایەوە و وتی:

- کەوتومەتە دەست دوو شێت!

هیچی بەبیرا نەهات لەوە بەولاوە کە وازیان لێبێنی هەتا ئەگەنە ئێستگەیەکی تر لەوێ بەهێزی پۆلیس دایان بەزێنێ.

راسپۆتین گوێ نەدا بە پشکنێر و قۆڵی کرد بە قۆڵی بەرنابادا بەجوتە لێیان دا و دەستیان کرد بە گەڕان بەناو ژووری واگۆنەکانی نوستنا، هەتا گەیشتنە واگۆنی خۆراك، با بۆ خوا بڵێن پێشوازییەکی باش کران چونکە بوونی ئەم دوو لەندەهوڕە لەم شوێنەدا مایەی ڕابواردن و کات بەسەر بردنە لەم ڕێگە دوور و درێژە بێ بڕانەوەیەدا.

گومانی تیا نیە کە سواربووە بێگانەکان لەم شەمەندەفەرە نایابەدا هێشتا چاویان بە دەروێشی ڕوسیا نەکەوتووە، وە بگرە هەر بە پادیشیان دا

نەهاتبێ کە جانەوەری واش هەیە لە جیهان دا، لەبەرئەوە سواربووەکان زۆر سەرسام بوون بەتایبەتی ئافرەتە ئینگلیزەکان، کە بەشی هەرە زۆری ئافرەتی ئەم کاروانە لە ژنانی ئینگلیزن، یەکێ لەو ئافرەتانە کە چاویلکەیەکی چوارچێوە زێڕینی بەدەستەوە گرتبوو بەجۆرێ لەمانە ورد ئەبووەوە کە ئەبێ ئەمانە بارگیرین یا پەیکەرێکی زۆر سەیری کۆنی مۆزەخانەی قاهیرە!.

ئاخ خۆزگەم بیان زانیایە کە ئەمە ئەو باغەوانە دزە هەڵهاتوویە کە چەند سەلکە کەلەرمێکی کلێسەی دێکەی خۆیانی دزی بوو!!...

خواوراستان ئەمیرێکی ڕوسی لەناو سواربووەکان دا هەبوو ئەمەی بەدەرفەت زانی بۆ خۆنزیك کردنەوە لەو ژنە ئینگلیزانە بەتایبەتی ئینگلیزە چاویلکەدارەکەی ناومان برد، بۆیە خۆی تێهەڵقورتان و تەسی کرد بەشی کردنەوەو یەکالاکردنەوەی کارو پیشەی ئەم دوو دەروێشە و چۆنێتی بەڕێوەچوون و گوزەرانیان، وا دیاربوو قسەکانی لای ژنە ئینگلیزەکان خۆش بوو بۆیە بەسەرسوڕمانەوە لەپێکەنین دا ئەتەرەقینەوە.

بەڵام راسپۆتین کشومات دانیشتبوو، وەك چاوەڕوانی ئەوەبێ یەکێ لەو فریشتانە بەچۆکا بێ و بکەوێ بەسەر ئەژنۆیا هەر وەك ئافرەتە ساویلکە و نەفامەکانی سیبیریا، بەڵام چاوەڕوانی ئەو بێ هوودە بوو، کە لە وزەیا نەما ئەمەی فەرموو:

– من قەشە راسپۆتینم!

بەڵام ئەوەی لەبیر چوو کە ڕوسەکان نەبێ ئەوانی تر لەو تێناگەن، لەگەڵ ئەوەش دا ئەو ئەمیرە لەم و لەو هێندی لە کەرامەت و مەعجیزەی ئەم دەروێشە چاوزەقەی بیستبوو بۆیە ویستی لەم ڕووەوە ئافرەتە ئینگلیزەکان بورووژێنێ، بۆیە کەوتە پیاهەڵخوێندن بەشان و باهوی کەرامەت و موعجیزەی ئەم قەشە ناودارە بەزمانی ئینگلیزی و فەرەنسی.

ئا لەم کاتەدا یەکێ لەپێش خزمەتەکان پەیدا بوو، نیازی دەرکردنی ئەم

دوو چەپەڵە بوو، بەڵام ئەم و ئەو بۆیان تێکەوتن چونکە ئەیانویست ئەم رابواردنە سەیرەیان لەدەست نەچێ!
هێندەی نەخایان کە دەوروبەری دەروێش و قەشە ئابڵۆقەدار بە پێڕێ فریشتەی جوانی ئەورووپا، لەگەڵ ژمارەیەك لەسواربووە بەرزەکان، لەبەردەمیان دا وەك یەکێ لە دێوەکانی هندستان یان گەمەکەرێکی تیاتروخانە هەتا هەندی لە سواربووەکان بیری خۆیان دەربڕی کە ئامادەن چ دەورێکیان پێ ئەسپێرن بەوپەڕی پێخۆش بوونەوە پێی هەڵسن، بەڵام راسپۆتین بەسەلیقەی خۆی دڵنیا بوو کە ئەم بێگانانە وەك ئافرەتەکانی لای خۆیان نین دەماری شێتی و لەخواترسانیان وایان لێبکا بەئاسانی بکەونە ژێر ڕکێفی دەسەلات و توانایەوە، بۆیە بەپێك هەڵدانی شەمپانیاوە خۆی خەریك کرد کە بەلایەوە خواردنەوەیەکی تازەو خۆش بوو.
بەڵام دەروێش بەرنابا، بەپێك تەسکینی نەئەهات پەلاماری شوشەیەك شەمپانیای دابوو نابووی بەسەریەوە لەبەرەوە ورگی خۆی لێ پڕئەکرد، ئەم بزوتنەوەیە بەلای ئافرەتە ئینگلیزەکانەوە پەسەند نەبوو.
کە ماوەیەکی زۆر بەسەرچوو بێ ئەوەی نیشانەی موعجیزە و کەرامەت لە راسپۆتین دەرکەوێ مەگەر وڕێنەو بزڕکاندنی سەرخۆشیان و ئارەق کردنەوەو بۆگەنی لەشیان کە ئافرەتە ئینگلیزەکانی قانگ دابوو، ناچاری کردن بەگورجی هەڵبێن و بگەڕێنەوە ناو جێگاکانیان لە واگۆنی نوستن، کە بەسراوەتەوە بە شەمەندەفەرەکەوە، بەم پێیە هەتا وای لێهات واگۆنی نان خواردن جگە لەم دوو پیاوچاکە و ئەمیرە ڕوسیەکە و چەند سواربوویەکی کەم کەسی تیا نەما وای لێهات دانیشتنەکەیان خۆماڵی بێ، ئیتر شەرم و شکۆ لەگۆڕا نەما و رابواردن لەسەر نەریتی ڕوسی کۆن دەستی پێکرد.
یەکێ لە سواربووەکان هەڵسا دەستی کرد بە سەما کردن لەسەر شێوەی ڕوسی، لەوجۆرە هەڵپەڕکێ تەنهاییەی کە سەماکەر وەك دانیشتبێ لەپڕ ئەکەوێتە سەرپێ و بەملاو بەولای خۆیدا دێت و ئەچێ پیاو سەرسام ئەبێ

کە چۆن ناکەوێ، وە چۆن ئەتوانێ وا خۆی بسورێنێتەوە، لەپڕ ئەبینی لەدانیشتنەوە راوەستاوە، وەخۆی بەئاسمان دا هەڵئەدا بۆ بەرزیەکی زۆر، وە قریوەی بۆ ئەکا وەك درندەیە لەشەڕا بێت.

ئەوانی تر بەم هەواو قریوە قریوەی سەماکەرەکە گەرم بووبوون، بۆیان ئەدا لەچەپڵە، بەڵام بەساردو سڕی هەتا ئەم دیمەنە کاری کردە سەر دەروێش بەرنابا کە ئەویش کەوتە جۆش و خرۆش کەوتە لاسایی کردنەوەو سەماکردن بەخۆی و زنجیرو بارو بارخانەیەوە کەسەر بەقوڕی ئەهێنایە پێکەنین!

لەناو ئەم دەست خرۆش و خومارەدا تەنها کەسێ نەشێوابێ هەر راسپۆتین بوو کە بەبێ دەنگی و بەلالوتێکەوە سەیری ئەکردن.

کە لە هەڵپەرکێ تێریان خوارد لەسەر نەریت و خوی ڕوسی خۆیان هەریەکە چمکێکی ئەو سفرە و خوانەی گرت کەپێش قەیرێ خواردن و خواردنەوەیان لەسەر ئەخوارد هەڵیان دا هەرچی لەسەر بوو لەقاپ و شوشەوات بە ئاسمان دا چوو پاشان بەربوونەوە هەپروون بە هەپروون بوون!

بەم جۆرە کۆتایی بە ئاهەنگی ناکاتیان هێنا و تروسکەی گەرمی شەونخونەکان بەجارێ گوژایەوە. پێش خزمەتەکانی واگۆنی خواردن ژێرییان نواند کە هەر خۆیان لێنەکردن بە خاوەن و بەس، بەڵکو هەریەکە خۆی کوتایە ژووری خۆی دوور لە ئاهەنگ، چونکە ئەیانزانی بەیانی لەگەڵ گزنگی خۆردا هەرچیەکیان شکاندووە لە زەماوەندەکەیان دا بۆیان ئەبژێرن و بەخشیشیش وەرئەگرن!

**بەرەو روسیای ئەورووپی**

راسپۆتین و بەرنابا ئەو شەوەیان بەخۆشی بردەسەر، چونکە شازادەکانی ڕوس لە بەخشین دا دەست بڵاوبوون، کرێی سواربوونیان لەگەڵ خەرجی خواردن و خواردنەوەدا هەتا دوا قۆناغی ئەو ڕێگە دوور و

درێژە بۆدان. جگە لە وردە خەرجی گیرفانیان!

بۆ یەکەمجار لەژیان دا راسپۆتین خۆی لەناو دۆشەك و لێفەی نایاب دا دی کە پەتۆی نەرم و لوسی گەرمیان ئەدا بەسەر خۆیان دا، نەك هەر ئەمە و بەس بەڵکو ئەمە یەکەم جاریەتی لە شوێنێك دا ئەنوێ دوورە لە کێچ و ئەسپێ.

بەلام بەرنابا ئەوە هەر لێی مەپرسە، لەژێر خەیاڵی خوماری دا وای ئەزانی لە بەهەشت دا ئەژی بۆیە بە راسپۆتینی ئەوت:

- نەم وت ئەی لالە کریکۆر خواناسی لەوەرگایەکی خۆشە، دوایی‌یەکەشی چوونە بەهەشتە، وا ئێستا ئێمە لە بەهەشتاین!

کە رووی جیهان ڕووناك بووەوە، پیاوانی سەروکاری شەمەندەفەر هاتنە خزمەتیان و پێیان ڕاگەیاندن، کە نابێ لەژوورەکەیان دەربچن، هەتا بۆن و بەرامەی چەپەڵی‌یان خەڵکەکە بێزار نەکا. بەم قسانە هیچ دڵگیر نەبوون، کێ وای بۆ ئەلوێ شوشەی شمپانیا و هەمە چەشنە خۆراکی خۆش خۆشی بێ ماندووبوون بۆ بێتە کونی ژوورەوە، ئەو ژوورەی واگۆنەی بە پەردە و کەلوپەلی نایاب ڕازێنراوەتەوە!

بەرنابا هەر شاگەشکە بوو بەو بەڵغەم دانە ئەمریکاییەی بە زەرکەف ڕەنگ کرابوو ئەبریسکایەوە، هەر هەڵی گرتبوو خستیە ناوگەڵی خۆیەوە، هەتا نزیك بێ لەدەمی خاوێنی!

ئەو ڕۆژەشیان بەشادومانی و سەرخشی بردەسەر، بۆنی ئارەقەی چڵك و چەپەڵی لەشیان نەك هەر ژوورەکەی کە تیا دانیشتوون قانگ دابوو بەڵکو گەیشتبووە کۆلانی واگۆنەکانی دراوسێیان، بۆشەوی ئاینده تێرو پڕ خەوتن.

کەڕۆژ بووەوە شەمەندەفەرەکە چیاکانی ئۆڕاڵی بڕی بوو گەیشتبووە زەوی و زاری ڕوسایی ئەوروپی، ئەو کاتە دەست بەجێ راسپۆتین بڕیای

دابەزینی دا، هەتا گەشت و گەرانەکەیان بۆسەر مەزار و گۆڕی پیاو چاك و شوێنە پیرۆزەکان بە پێیان تەواوکەن.

راسپۆتین لەم ژیانە تازەیە وەرس بوو، لەڕاستیش دا سواربوونی شەمەندەفەر لەوانە نەبوو ڕەواج و بایەخ بە فێڵ و کەڵەکەکەیان بدا.

راسپۆتین هەر بە پاڵێ بەرنابای خستە پێش خۆی وە لە یەکەم ئێستگەی ڕوسیای ئەورووپی دابەزین، بە هاتنە خوارەوەیان سواربووەکان ئاسودە بوون، وەك مۆتەکە لەسەر شانیان دابەزی بێت.

راسپۆتین لەم لەوەرگا تازەیەدا فێری شەمپانیا خواردنەوە بوو بوو جگە لەوەی بۆ یەکەمجار لە ژیانیا بەرەنگاری شارستانێتی ڕۆژئاواش بوو، لەوەش دڵنیا بوو کە فرۆفێڵی هەر بۆ ڕوسیا و بۆ ناو ئەو خەڵکە ساویلکانە دەست ئەدا، ڕۆژئاواییەکان لێی تێناگەن و سەرکەوتنی هەڵناسەنگێنن.

بەڵام بەرنابا خوڕ خوڕ ئاو بەچاویا ئەهاتە خوارێ و بەدەم قوڵی گریانەوە بە راسپۆتینی وت:

– بۆ نەتهێشت چەند ڕۆژێکی تر لەو بەهەشتەدا بووینایە، هەتا ئەگەیشتینە مۆسکۆ بەخۆشی و بێ ماندوو بوون!

راسپۆتین وەك پشیلە مۆڕبووەوەو وتی:

– ئای کە چەند گەوجی! بۆ دوو پیاوی خاوەن موعجیزە و کەرامەت لواوە لە واگۆنێکی نوستن دا بگەنە شارێکی وەك مۆسکۆ، ئەمە بە تەنها لەوانەیە هەموو ڕەنجمان بەفیڕۆ بدا، وە نرخمان

بۆ نەهێڵێتەوە، دەست مایەمان ملکەچی دەروێشی یە ئەی بەرنابای زیرەك، ئێستا زانیم کە بەکەڵکی ئەوە نایەیت ببیتە گەورەیەکی ئاینی، بەم پێیە هەتایە بەسواڵکەری ئەمێنیتەوە وەك قەلەڕەش هەر بەشت گەنگەخواردنە!

قسەکانی وەك نەخشی سەر بەرد بوو، پەلی بەرنابای گرتوو کەوتنەوە ڕۆیشتن، هەتا گەیشتنە گوندێك، هێندەی نەخایاند لەم ناوەدا لە سیبیریا زیاتر دەنگیان دایەوە، بەتایبەتی کە ئێستا توانا و سەلیقەی لە جاران بەهێزتر بووە، هەر بۆیەکیش لەجاران چاو قایم تر بوو، بۆ لەخشتە بردن و فریودانی ئافرەتە بەسەرزمانەکان کەدوای دەست درێژی بۆسەر ناموسیان، بای ئەدایەوە سەر هەڵخەڵەتاندنیان و رام کردنیان بەو بیانوەی کە ئەبێ دوای گوناهباری تۆبە بکەن لەسەر دەستی خۆیا، هەتا پتر خێرو بەرەکەتی پەشیمانی بۆ دواڕۆژیان کۆبکەنەوە، بۆیە دوای کاری خێر ئەمەی پێ ئەوتن:

– بەختەوەری پەشیمانی جارێکی تۆبەکارێك لە ڕۆژی زیندووبوونەوەدا سەد ئەوەندەی بەختەوەری کەسێکە کە لە ژیانیا بەهەڵەدا نەچووە!

ئا بەم قسە هیچ و پوچانە دڵخۆشی نێچیرەکانی خۆی ئەدایەوە هەتا ئەوانیش نەك هەر خۆیانیان پێ هەڵخەڵەتان و بەس بەڵکو ئەبوونە داردەست بۆ لەخشتە بردنی ئافرەتانی تر، بۆ هاتنە ناو داوی ئەم قەشە ناپاکەوە، هەتا پتر بەشداربن لەو بەختەوەرییەی کە بۆیان ئەنوسرێت لەدوای هەموو تۆبەیەك کە دەستگیریان ئەبێ لە تێکەڵ بوونیان لەگەڵ ئەم داوێن پیسەدا.

بەم جۆرە ڕۆژ بە ڕۆژ دۆستەکانی لە زۆربوون بوو لەو گوندانەی تیایان دا ئەبوونە میوان، وە راسپۆتین بێ شەرم و شکۆ بە ئاشکرا ناوی ئەنان (ژنە گیانیەکانم) ئەمەش پاداشتێکی ئەوتۆ بوو هەموو ئافرەتێکیان بەئاسانی نە ئەگەیشتە ئەو پایە بەرزییە!

**لە پەرستگایەکا**

لە ئێوارەی ڕۆژێ لە ڕۆژانی گەشتەکەیانا گەیشتنە (دێرێك) لە دێری ئافرەتە ڕەبەنەکان، ئەی ڕووانی بەسەر ڕووباری (فۆلگا)دا، لە جوانترین شوێنێك دا.

شێوەی دێرەکە، بە گومەزە زۆر ڕەنگاو ڕەنگەکانیا، کە هێندێکیان کەسك و هێندێکی تریان سوور و بەشێکیشیان زەرد و چەند چلیپایەکی زێڕین بەسەر گومەزەکانەوە بوون لەبەر تیشکی خۆرەکە ئەدرەوشانەوە، دڵو دەروونی هونەرمەندانی جوان ئەکردەوە.

ئەگەر چی ئەم دووانە هونەرمەندیش نەبوون لەگەڵ ئەوەش دا سەرسامی ئەو دیمەنە بوون، وا بەبیری بەرنابادا هات کە ئەبێ ئەم شوێنە نایابە چێشتخانەیەکی بێ وێنەشی تیا هەبێ، بەڵام راسپۆتین دڵ و دەروونی لای ئافرەتە رەبەنەکان بوو.

کە لە دەرگای دێرەکەیان دا، سەرۆکی ژنە ڕەبەنەکان، کە ناوی خوشکە (ماریا جۆزیف) بوو پێشوازییەکی گەرمی لێکردن، ئەم ئافرەتە ژنێکی گران بوو، لە بنەماڵەیەکی وەجاخ زادە، ڕەهبانیەت شێوەی سروشتی ئەدەب و سەلارەیی نەشێواند بوو، بزوتنەوەی ئەوپەڕی وردی نیشان ئەدا لە پێشوازی کردنەکەیدا.

بەرنابا تێبینی ئەم لایەنەی کرد بەبێ چەندوچوون، بەڵام راسپۆتین بەتەنگەوە نەهات، هەر وای دانا کە ئەم ئافرەتەش مێینەیەکی چارەگرانی ناشرینە و بەس، بۆیە وەك برسی ڕووی وەرچەرخان بۆ سەرنج دان لەو کچە گەنجە ڕەبەنانەی لەتافی جوانی دا بوون، دەستە دەستە ڕوویان ئەکردە دێرەکە بۆ نوێژی شێوان.

ئەم چاو گێڕدانەی راسپۆتین شتێکی ئاشکرا بوو لەلای ماریا کە ئەبێ ئەم لەندەهورە دوور بێ لەداوێن پاکی و خواناسییەوە. هەر لەبەرئەم

هۆیــە بــوو کــە راســپۆتینی خســتە ژێــر چــاودێرییەکی تونــد و تۆڵــەوە ئەوەندەی بمێنێتەوە بۆ پاراستنی ناموسی ئەو ئافرەتانەی دێرەکەیان پڕ کردووە.

بەشێك لەشەو ڕابورد، لـە نوێـژی خـەوتن دا، ئەوەنـدە چالاکی نوانـد بـۆ نواندنی ڕادەی خواناسی خۆی، لەگەڵ ئەوەش دا بەپەرۆشەوە چاوی بڕی بووە چاوی کیـژێ لـە ڕەبەنـەکان، کـە لـەناو هـەموویان دا هـەڵی بـژاردبوو بەوەی لە هەموویان ناسك و نازدار ترە!

کە لەنوێـژ بڵاوەیـان کـرد لـە دالانـی دێرەکەدا بەرەنگاری ئـەو کیژۆڵەیـە بوو بەبێ ترس و لەسەرخۆ پێی وت:

– لەخوا بترسە وەرە لەگەڵم.

کیژۆڵە ڕەبەنەکە گەردن کەچی بۆ ئەم فەرمانـە پیرۆزە پیشـان دا و بـەبێ چەند وچوون، وەك بەرخ بەپێش خۆی دا، هەتا گەیشتنە ژوورەکەی، ئـەو ژوورەی بــۆ مانــەوەی تــەرخان کــراوە، دەرگــای لەســەرخۆیان پێــوەدا، کیژۆڵەکە کەوتبووە ژێر کەمەندی ئەو شەپۆلە مەگناتیسیەی لە چاوەکانی (پیاوی خوا) دەرئەچێ!

هـەر چـەند چـرکەیەکی نەخایانـد کچـە لـە بـەردەمی دا بەچۆکا هـات و دەستی کرد لە لستنەوە و ماچ کردنی دەسـتە کرێشـاویەکانی، بـێ ئـەوەی هەست بەو هەموو چڵکە بکا کە لەناو نینۆکە درێژەکانیا کۆبۆتەوە.

هێندەی نەبرد کیژە خۆشی هاویشتە باوەشیەوە، ئەویش هەر بە زەبری هێزی موگناتیسی بێ وێنەی چاوەکانیەوە، بەیەکەوەنووسان، دەموچاوی ناسك و ڕوومەتی شەکرەسێوی ئەهێنا بە سنـگ و ڕیشـی درێـژی قەشـەدا، خۆشیەکی زۆر بە لەشی کچەدا بڵاوبووەوە بە گرتنی ماسولکەی بازووە پۆڵاییەکانی کە لە کەمەری توند بووبوو.

ئـا لـەم کاتـەدا بـوو (دایـە ماریـا) بـۆ پشـکنین چووبووە دەرەوە بـەنیازی

پاراستنی ڕێك و پێکی ناو پەرستگاکە، لە هەمان کاتیشا بۆ پاراستنی ئەو ئافرەتە گەنجانەی ناو ئەو دێرە لە دەست درێژی، بەهێواشی دەرگاکەی لەسەر کردنەوە، ڕووانییە ژوورەکەی راسپۆتین، ئایا ئەبێت چی بنیبێت ئەبینێ وا بەجووتە لەکاری خێران! لەسەرەتادا خەریك بوو بقیژێنێ بەسەریانا، بەڵام لەدوایی دا پشتاوپشت گەڕایەوە، لەبەرخۆیەوە ئەیوت:

– ئای لەم جانەوەرە داوێن پیسە! ئا ئەوەتا لە ماڵی خوادا لەگەڵ کچە ڕەبەنێکا خەریکە کە جیهانی بەخۆی، ئەفەرۆز کردووە بۆ گەیشتن بە ڕەزامەندی خوا؟!

بەگورجی چوو دەرگاوانەکەی دێر، کە لەندەهورێکی زل و زەبەلاح بوو لەگەڵ دوو باغەوانی دێرەکە کە لە دەرگاوانەکە بەهێز و گووڕتر و گەوج تر بوون، گازی کردن، هەریەکە سەرو تێلایان بەدەستەوە گرت و هاتن بەدوای خوشکە ماریادا، بەرەو ژوورەکەی راسپۆتین، خوشکە ماریا بەشێنەیی لە دەرگاکەی دان و دەنگی خۆی لێ ناسك کردەوە، وتی:

– ئەی باوکی بەڕێز ئایا ناتەوێ کیژێکی میوان بێتە خزمەتت و لەلات بمێنێتەوە؟!

ئەم دەنگە مۆسیقاویە بەتەواوی ورووژانی و دەماری حەیوانی کەوتە بزووتن، بۆیە بەخۆشی‌یەکەوە هەڵساو دەرگاکەی کردەوە بەنیازی دەستگیربوونی لە نێچیرێکی تازە، هەتا رابواردنی شەوی پێ بەرێتە سەر!

لەکاتێکا کیژە ڕاهبە گەنجەکە خەریکی خۆ پۆشتە کردنەوە بوو، بەخۆ خزانە ناو دوو توێی نوێنەکە بۆ چارەسەرکردنی دەردی ڕووتی و قوتی و بۆ ڕزگارکردنی خۆی لەچاوی دەرگاوان و دوو باخەوانەکە، ئا لەم کاتەدا تێلا بەدوای تێلادا دائەباری بەسەر پۆتەڵاك و سەروگوێلاکی

نەگریسی (باوکی گەورەو گران) پیاوی پیرۆزی خوا کریکۆریناموبارەك دا.

ناکاوی سەری لە راسپۆتین شێواند، پەلەقاژەیەکی ئەوتۆی بۆ نەکرا، ئەگەر چی هێزو توانای ئەو قەڵافەتە گەورەیەی لە پێنج گاجووت زیاتر بوو.

چەند هەناسەیەکی نەخایاند هەموو لەشی تێك شکێنراو سەرو گوێلاکی بوو بە خەڵتانی خوێن و سپیاڵی لەبەردا ونجڕ ونجڕبوو بەوەشەوە نەوەستان فڕێیان دایە چاڵێکەوە لە دەرەوەی دێرەکە، کە بەرماوەی خواردن و خۆراکی دێرەکەیان لێ ڕۆئەکرد بۆ سەگە خوێڕیەکان!

دوو دەقیقەی نەبرد کەلاکێکی تریش بەردرایەوە بەسەر کەلاکی راسپۆتینا ئەویش کەلاکی بەرنابا بوو، کە لە خەوی شیرین دا دایان چڵەکاندبوو بەهۆی دەست درێژی راسپۆتینەوە وا ئەمیش بەدەردی ئەو چوو، ئەو خواردنەی کەلەسەر مێزەکەی (دایە ماریا جۆزیف) خواردبووی بەم لێدانە هەمووی یەق دایەوە.

بەوە چاك بوو وەرز زستان نەبوو کات دەمە دەمی هاوین بوو چونکە نەیان ئەتوانی لەبەر لێدان لەشوێنی خۆیان ببزوێن لەتاو ئازاری لەشیان، بۆیە بەبێ چرکە لەو شوێنەدا مانەوە بە نکە نك هەتا ڕۆژیان لێبووەوە!

کە ڕۆژ گزنگی دا، دەنگی نوێژو ویرد خوێندن بەو دەنگە ناسکانەی لە ئافرەتەکانی دێرەکە بەرز ئەبووەوە بەئاگای هێنان، ئەو دەنگەش سرودی نوێژی بەیانی کیژە ڕەبەنەکان بوو، بەرنابا چاوی هەڵهانی هەستی بە ئازارێکی زۆر کرد، بەهۆی ئەو تێکشکاندنەی لەشیەوە، بە راسپۆتینی وت:

– وا بزانم ناتوانم جارێکی تر چوارمشقی دابنیشم، چونکە ئەوەندە

تێلا شەقم خواردووە بە پێڵاوە بن ئاسنینەکانیان، پێکانم لەدووم نایەن، ئەمەش هەمووی بەهۆی جوڵانەوەی نابەجێی جەنابتەوە، بەری جیهان دوورو درێژە هەر ئافرەت زۆرە، هیچ نەماوە پەلاماری کچە ڕەبەنەکان نەبێ ئەی کاک کریکۆری بەڕێز!

– ئەی گەلحۆ بێدەنگ بە! بەڕاستی بەهەڵەداچووم، بەڵام هەڵەکەشم ئەوە نیە کە ئەو کیژە ڕاهیبە جوانەم لەخشتە بردووە، بەگیانی خۆم ئەمە ئەوپەڕی ڕاستیە! بەڵکو هەڵەکەم لەوەدا بوو کە گوێم بەو پیرەژنە سەگانیەی سەرۆکیان نەدا، کە کۆڵەکەی وەستانی کۆمەڵ هەر ئەوانن، هەر وەك چۆن پیاوە پیرەکان کۆڵەکەی ڕاستەقینەی لیژنە ئاینیەکانن، ئەوەی بیەوێ سەرکەوتن مسۆگەر بکا بۆخۆی ئەبێ بەرلە هەموو شت دڵی ئەو پیرانە ڕاکێشێ بەلای خۆی دا، بەپشتگیری ئەوان هەموو دەرگایەك ئەکەوێتە سەر گازی پشت، هەموو کەموکوڕیەکی پیاو ئەبێتە چاکە!

لێرەدا راسپۆتین هەناسەیەکی هەڵکێشا هەستی بە چوارپەلی تێك شکاوی خۆی کرد، دڵخۆشی خۆی بەمە دایەوە:

– ئارامت هەبێ ئەی کریکۆر، گوڵ بێ دڕك نابێ، کەڵەشێریش نەبێ هەر ڕۆژ ئەبێتەوە!

**لەبەردەم قەڵای کرملینا**

ئەو سەرمەشقە ئازاراویەی راسپۆتین لە دێری ڕاهیبات دەرس دارێکی بەنرخ بوو، لەپاش ئەو کارەساتە، پێشەکی هەر هەنگاوێکی تازەی بنایە حسابی تایبەتی بۆ ئەکرد، وە بەر لە هەموو شتێك دڵی بەسالاچووەکانی بۆخۆی ڕائەکێشا.

ئەم پیلانە تازەیە زۆر بەکەڵك بوو، چونکە پیرەکان پشتیوانێکن بە هیچ شتێك نرخیان نایەت، ئەمەش هیچی تێنەچوو لە کەمێ زمان لوسی بەولاوە، وە زۆر جار هیچ جۆرە خۆماندوو کردنێکی نە ئەویست. بەرنابا لەم ڕووەوە هەر هاندەری بوو، پەیتا پەیتا بەگوێیا هەڵئەخوێند:

– ناو و ناوبانگی پیاوانی گەورە، هەتا ناوبانگی پیاوچاکان، نوساندنی لەکەی ناشرین بە کیژۆڵەیەکی جوانی وەك فریشتەوە یا ناو دەرکردنی بە داوێن پاکی، ئەمانە هەمووی تەنها بەزمان گێڕانێکی چاك یا خراپی چەند پیرێژنێکی قرچۆڵی خاوەن پایەی ناو کۆمەڵەوە بەندە!

راسپۆتین گوێی بۆ ئەم ئامۆژگاریانە شل کردبوو، پەیمانی دا بە بەرنابا کە هەرگیز لەیادی نەکا ئەگەر چەرخی ڕۆژگار بە ئارەزووی دڵی ئەو سوڕا، ئەو کاتە بیگەیێنێتە ئەسقەفێکی بەرز و گران، بۆیە ئەمەی پێ وت:

– تۆ هەڵئەگری بگەی بە پلەو پایەی ئەسقەفێکی بەرز، تۆ ئەو پایەیە هەڵئەگری و لەشان و شەوکەتت ئەوەشێتەوە، بەشارەزاییت ئەتوانی دڵ و دەروونی ئافرەتان بخوێنیتەوە بەتایبەتی پیرەژنەکانیان!

ئەم دوو برادەرە گەڕیدەیە کە لەوە دڵنیابوون کە ناوبانگیان هەموو دێهاتەکانی ڕوسیای ئەورووپی تەنیوەتەوە، بڕیاریان دا بچن بۆ (مۆسکۆ) ئەو شارەی زەمانێکی دوورو درێژ پایتەختی میری بوو، بەرلەوەی کە پترس بورگ بکرێتە پایتەخت!

ڕۆژێ لەڕۆژان گەشتەکەیان بەپیان گەیشتنە مۆسکۆ، بە بینینی دیمەنی کۆشکە کۆنەکانی و کڵێسە گەورەکان و فراوانی شارەکە ورووکاس بووبوون، بەر لە هەموو شت ڕوویان کردە کڵێسەی (عەزرا) بۆ نوێژکردن، کە لە نوێژبوونەوە دەستیان کرد بە سوڕانەوەی بە شارەکەدا چوون بۆ سەیرو تەماشای گۆڕەپانی (کراسنۆیا) و قەڵای (کرملین) کە دیوارەکانی لە خشتی سور دروست کراوە لە پشتیەوە گومەزی زێڕینی گەورەی پیاوچاك (یۆحنا) و باڵاو بەژنی ئەو کۆشکانە دیاربوون کە جێگای دێرینی قەیسەرەکانە، جاروبار بۆ بیرەوەری ڕابردوویان دیدەنیان ئەکرد لە پایتەختی باوك باپیرانیان!

لێرەدا راسپۆتین بەبێ دەنگی وەستابوو، لەو دیمەنە سەیرانە ورد ئەبووەوە کە بەتەواوی گێژووریان کردبوو لەبەر خۆیەوە وتی:

–لێرە دڵی زیندوی پیرۆزی ڕوسیا لێئەدا!

وا بەمێشکیا هات کە داگیرکردنی ئەو قەڵا سەختەی (کرملین) سەرچڵی و کەللەڕەقی و هەتا کەرێتیەکی زۆری ئەوێت – لەگەڵ ئەوش دا هەر بە خۆیا ڕائەپەرموو بتوانێ هەموو جۆرە کۆسپێك تەخت کا، ئەگەر چاو نەترس و بەئارام بێ.

ئەم باوەڕیشی بەخۆی لەوەوە هاتبوو کە ڕۆژ بەڕۆژ ئەستێرەی بەختی لەبەرز بوونەوەو گەشەدا بوو، باوەڕی ئەم جانەوەرە سەیرە هەر لە باوەڕی ئەو جیهان گیرانە ئەچوو کە هەموو کۆسپێکی سەختی ڕێگایان بە پشت بەخۆبەستن تەخت ئەکەن.

لە چەند هەفتەی سەرەتای گەیشتنیان بە مۆسکۆ ژیانیان ئاسودە نەبوو، چونکە ئەم شارە ئەگەرچی سروشت و سەروسیمای ڕۆژهەڵاتانە هەڵکەوتبوو، لەگەڵ ئەوەش دا، شارستانێتی ڕۆژئاوایی خۆی گەیاندبووە دڵ و دەروونی دانیشتوانەکانی، ئەوەبوو پتر بەتەنگ هەواڵی

سەماكەرێكی ئۆپێرا وەیا كارەساتێكی تیاترویەك یا شێوەی مۆدەیەكی پاریسی یا بەرزبونەوەی نرخ لە بازاڕەكانی بازرگانێتی و ماڵداریەوە بوون لەوەی دڵ و سەرنج بدەنە موعجیزە و كەرامەتی لەڕادەبەدەری ئەم جانەوەرە.

ڕۆشنبیرەكانی مۆسكۆ چاویان لە ڕۆژئاوا بڕیوە، چ بۆ زانیاری وە چ بۆ نەزمی خۆشی و ڕابواردن، ئامادەنین ڕوو وەرگێڕن بەرەو سیبیریا بۆ بینینی قەشەیەكی چەپەڵی گەڕۆك كە بۆ دەست بڕی ڕووی كۆكردۆتە ئێرە.

لەبەرئەوە سەركەوتنی راسپۆتین لەم ماوەیەدا بریتی بوو لە چاك كردنەوەی چەند ئافرەتێك لەوانەی وەك شێت باوەشیان كردووە بە ئاین دا، ئا لەم چین و توێژە نزمانەوە ناوبانگی بەرگوێی كەسانی چینی بەرزكەوتەوە، هەتا وای لێهات هەندێ ژنە دەوڵەمەند چاوەڕوانی ئەوە بوون كە راسپۆتین خۆی بچێ و لە دەرگای ماڵیان بدا بەڵام راسپۆتین ئەمەی نەكرد، بەوەی چاپك و هۆشیار بوو لە هەنگاو هەڵگرتنا بۆیە هەردانی بەخۆیا گرت هەتا ئەوان داوای كەن نەك ئەم داواكاریان بێ، چونكە لەو باوەڕەدا بوو داواكەر هەمیشە بەر زیان ئەكەوێ.

لە ئەنجام دا ژمارەیەك لە ژنانی چینی بەرز لە مۆسكۆ، كەوتنە پاڕانەوەو لالانەوە لە قەشەی بێبار، بەكۆمەڵ بەردەرگایان پێ گرت، ئەمیش لە یەكەم جارا بەساردیەوە لەگەڵیان دا جولایەوە، بەو نیازەی بیان خروشێنێ، هەتا بەپەرۆش بن بۆ بینینی سەمتی موعجیزە و كەرامەتی بێ وێنەی!

ئەمە لەلایەك لەلایەكی تریشەوە راسپۆتین لە دەسەلاتی توندو تیژی باڵ بازی نەهێنی (الشرطة السرية) كە بە (ئۆكرانا) ئەناسرا ئەسڵەمیەوە، لەوە ئەترسا كە پەیوەندی لەگەڵ ژنانی چینی بەرز بێتە هۆی ماڵوێرانی

بۆی، بۆیە ئەگەڕا بەدوای مسۆگەر کردنی ڕەزامەندی ئەوانا، چونکە دەسەڵاتی ئەو بەشە پۆلیسە بێ سنور بوو هەرچیەکیان بکردایە لێ پرسینە نەبوو.!!

هەموو جارێ برینی پڕ لەئێش و ئازاری دێری ڕاهبانی بیرئەکەوتەوە، ئەو کاتانەی کە دڵی ایێی ئەدا بۆ فریودانی ژنانی ئەم چینە، لەبەرئەوە سەبووری خۆی بە ژنانی چینی نزم و مامناوەندی ئەهێنا!

بەلاّم ئەم ژنانە هەر زوو ڕاسپوّتینیان وەرس کرد، بەجۆرێ لەبەرئەوان مۆسکۆی لەبەرچاو کەوت، لەهەمان کات دا ئەی زانی مەیدانی بۆ چۆڵ نابێ بەبێ ڕەزامەندی باڵ بازی نەهێنی، وە دۆستایەتی لەگەڵ لیژنەی کلێسەی پیرۆزدا، کە بەناوی (سنوسی پیرۆز) ئەناسرا.

لەبەرئەوە ڕۆژێك لە ڕۆژان بڕیاری دا کە بچێ بۆ پترسبورگ پایتەختی نوێی میری، بەو نیازەی ئەم دوو لایەنە مسۆگەر بکا، شاری پترسبورگ دوا قۆنـاغی ئـەو گەشـتە دوورو درێژەیـە کـە لـە چـۆڵ و بیابـانی سەهۆڵبەندانی سیبیریاوە دەستی پێ کرد بۆ گەیشتن بە پایە و شوێن!

ئەم جارە بەرنابای لەتەك خۆیا نەبرد، چونکە پێویستی بەو نەما بوو، پاش ئەوەی ناوبانگی هەموو مۆسکۆی داگیرکردبوو، وە سەرو گوێلاك و خوڕەوشتی بەرنابا پتر لە کۆچەرەکانی سیبیریا ئەچوو کە لای دانیشتوانی شوێنێکی وەك پترسبورگ پەسەند نیە کە لە مۆسکۆش زیاتر شارستانیەتی ڕۆژئاوایی کای لێکردووە بۆ ئەمەش پێویستی بە گوزەرنامەی تایبەتی هەبوو بۆ گەیشتن بە پایتەخت چونکە کەس بەبێ پرسی باڵ باز نەی ئەتوانی بچێتە پترس بورگ کە ئەویش لە پۆلیسخانەی مۆسکۆ وەرئەگیرا.

بەوەچاك بوو هێشتا ئەو ناسین نامەیەی (هویە) کە لە قەشەی گوندەکەی خۆیان وەری گرتبوو هەر لە باخەڵیا بوو، سەرەڕای ئەمەش

هەتا بەرتیلی نەکردە قولە مشتیانەوە گوزەرنامەی چنگ نەکەوت.

ئەگەرچی راسپۆتین زۆر چاوچنۆك و بەرچاوتەنگ بوو، بەلام لەم بەرتیل دانە دڵگیر نەبوو، ئەو چەند رۆبلە کەمەی دای بە بەرتیلا دەرسێکی تازەی تر بوو لەگەڵ شارەزاییەکی ترا، بەوەی تێگەیشت کە هەتا چ رادەیەك رژێمی ولاتگێری لە (روسیای پیرۆزا) شپرزە و هەرەس بردە و چەواشەیە!

**ئێرە پترس بورگە**

کۆنتیس (س) ژنێك بوو لە ژنە سەلارەکانی چینی بەرز لە شاری پترس بورگ دەردی زۆر خۆری لەو خواردن و خۆراکانە ئەخرانە سەر مێز و خوانی ئەم جۆرە بنەمالانە لەگەڵ پێك هەڵدان لەبەختی ئەوانەی تێکەڵیان ئەبێ ئەوەندەی گۆشت پێ گرتبوو لەئەندازە چووبووە دەرەوە، بۆیە بەجارێ گیرۆدەی تەمەڵی و لەجێگا کەوتن بوو بوو، هەمیشە لەسەر ئەو نوێنە نەرم و نۆڵە درێژ بوو بوو، چەند سەرین و پشتیەکی لەژێر باڵ و لاقەباغە و پشتیا دا ئەنرا، لە گورج و گۆڵی ماڵ گەڕان و ئاموشۆرەفتی ئەم ئەو کەوتبوو.

بۆ گرتن و پڕکردنەوەی ئەم کەلەبەرە لەژیانیا، وە بۆ دانەبڕان لەدەم بادان هەمیشە دەوروپشتی جمەی ئەهات بەو ژنانەی کە هەر بە فەرەنسی یەکتریان ئەدواند بە زمانێکی ڕێك و ڕەوان و پاراوی ئەوتۆ کە وشەکانی ئاوی ئەتێزایە دەمی گوێگرەکانیان، وە هەر بۆ یەکیش بەفەرەنسی ئەدوان هەتا پێش خزمەتەکانیان تێ نەگەن کەچی ئەڵێن و چی ئەپرسن!

لە ئێوارەیەکی ئەم کۆڕبەستنەیان دا کە کۆنتێس ئینتەلای کردبوو کەمێ سروشتی لەسەرخۆ نەبوو، دالانی دوورو درێژیان گەرم بوو، نزیکەی دە ئافرەتی خانەدان دەوریان لێ دابوو لە شێوەی نیمچە قوفڵێکی بەمانگ و ئەستێرەی درەوشاوە...

بێ گومان ویردی زمانی هەموویان لەو کاتەدا نەخۆشی یە بێ

دەرمانەکەی کۆنتێس بوو کە بنێشتە خۆشەی ژێردانی هەموو لایەکیان بوو، کۆنتێس سکاڵای ئێش و ئازاری خۆی بۆ ئەکردن، ئەوانیش هەریەکە بەئارەزووی خۆی کەوچکێ یا کەوگیرێکی تیا گرئەدا، بەکورتی گۆبەندی ئەو ئێوارەیە پتر لە پرسە ئەچوو، قسەکانیان لەم بابەتانە بوو:

- ئای دەستی شکاوم بۆت گیانی شیرینم، بەخوا ئازایت چۆن خۆت ڕائەگری لەژێر بارگرانی ئەو هەموو ئێش و ئازارەدا!!

- هەتا کەی گیرۆدەی دەستی ئێش و ئازار ئەبی؟!! ئەرێ توخوا ڕاستە ئەم جۆرە نەخۆشیە دوابڕاوە دەرمانی نیە؟

هەتا پلەیەکی تر لە پەیژەی گۆبەندەکەیان سەرکەوتن، بەوەی هەریەکەیان ناوبانگی دەرمانێك یان پزیشکی، یا شارێکی دووریان بۆ هەڵئەدا کە ڕەنگ هەیە چاك بێ یا هیچ نەبێ کەمێك لە ئێش و ئازاری سوك بکا!

هەتا یەکێکی کەیان هەنگاوێکی تەنیای سەیری هەڵهێنایەوە بۆ سەرکەوتن لەو پەیژەی گۆبەندەیان، ئەویش ئەوە بوو وتی:

- ئەگەر لەجیاتی تۆ بوومایە ئەی کۆنتێسی خۆشەویستم، خۆزگە من بومایە نەك تۆ!

- خوا نەکا خۆشەویستم خوا بتپارێزێ لەم بەڵایە!

- ئەڵێم ئەگەر من بوومایە لەجیاتی تۆ کەوا داوو دەرمان نەما، پزیشك نەما کە خۆت نەگەێنیتە لای، کەچی سودت لێ نەدی، من بوومایە ئەچووم بە جۆرێکی تر چارەسەری خۆمم ئەکرد، بەجۆرێکی گەلێ سەیر!!

- ئەم جۆرە چارەسەرکردنە چۆنە گیانەکەم؟!

- بیستومە ئەو قەشە بەناوبانگەی ناوی راسپۆتینە، ماوەیەکی کەمە هاتۆتە پترس بورگ، وە ئەم پیاوە بەرزە خاوەن بەهرەیەکی پیرۆزی ئەوتۆیە کە لەڕادەبەدەرە، لە کەسانێك کە هەرگیز گومان لە ڕاستیان

ناکرێ، بیستوومە کەرامەت و موعجیزەی ئەویان بۆ گێڕاوەتەوە، بەجۆرێك کە مێشك باوەڕی نایە!

یەکێکی تریان خۆی پێ ڕانەگیرا، کوتووپڕ بۆی مۆرکرد:

- منیش لە ڕاست گۆیانم بیستووە کە بەچاوی خۆیان موعجیزەیان لێ دیوە...

ئیتر ئەم هەڵەوەرە تازەیەیان درێژەی پێدا هەر نەیبڕیەوە، لەڕاستیش دا هێندێکی بیستبوو بەڵام بەشی زۆری وتووێژەکەی جاڵجاڵۆکەی مێشکی هەر لەو چەند هەناسەیەدا بۆی چنی و ئەمیش وەك بەڕوو لە دەمیا تەقیبێ هەر ئەی ڕست، هەتا تەنگە گەیشتە سێهەمیان و کەوتە بۆڕدانیان بەوەی ڕیسی ئەمیان لەوانەی پێشوو باریك تر بوو ئەوەی وتی لە قوتوی هیچ عەتارێکی ئەو سەردەمەدا نەبوو چەند کارەساتێکی لەڕادەبەدەری لکان بە راسپۆتینەوە، نێراو و نوماینندەی هەڵبژاردەی خوا.

وەك هەموومان ئەزانین ژن حەزی لەو شتانە زۆرە کە پەیوەندی بە سەرگوزەشتەی جنۆکە و خێوە و مێردزمە و شەوەو ئەو شتانەی لەناو بوخچەی جادووگەریا گرێ دراون کەوا دراون بەکۆڵی ئەو جادوگەرە دەست بڕ و درۆزنانەی کە هەر یەکە چەند فڕوفێڵێکی بۆ خۆی دۆزیوەتەوە بۆ خۆبەڕێوەبردن بە تەمەڵی و تەوەزەلی، لەبەرئەوە باس و خواسی پایە بڵندی (راسپۆتین) مافی تەواوی خۆی بە زیادەوە درایە لە دەمەتەقێ و گفتوگۆی ئەو ژنە سەلارانەدا!

لە کۆتایی ئەم باس و خواسانەدا کە کۆنتێس بەدڵ و بەگیان چووبووە ژێری ژنێکی کەیان وتی:

- من سەرم سوڕئەمێنێ ئەی کۆنتێس کە چۆن هەتا ئێستا لە هەواڵی ئەو پیاو چاکە بێ وێنەیە بێ ئاگای، مەگەر هەر ئەو بتوانێ ئەم جۆرە نەخۆشی یە بێ دەرمانە چاك بکاتەوە، من هیچ گومانم لەتوانای ئەودا نیە

لەم ڕووەوە!

ئەوانی تر هەڵیان دایە – بێ گومان!! بێ گومان نەخۆشی تۆ چیە لەچاو ئەو نەخۆشیانەی چاکی کردۆتەوە، ئەو نەخۆشیانەی کە نەخۆشەکانیان پزیشك دەستی لێشتبوون، کەچی ئەو بەچاو تروکاندنێ وەك گوێزی ساخی لێ کردنەوە!!

– بەچاو تروکاندنێ؟!

– بێ گومان!! چونکە بیستوومە ئەڵێن جوتێ چاوی پێوەیە لەو چاوانە تیژتر نەبینراوە، بەو چاوانەی چی لە دڵ و دەروون و مێشکی نەخۆشا بێ ئەیسمێ و ئەی خوێنێتەوە!

کۆنتێسی بەساڵاچوو کە لە خۆشیان دا گەشکەدار ببوو وتی:

– خۆشەویستەکانم بەڕاستتانە ئەوەی کە ئەڵێن؟

– ئایا شتی وا لەتوانای پیاوانی خوادا نیە؟ گومان لەتوانای خوا ناکرێ! ئەوەندەیان رست هەتا لەخشتەیان برد و هێنایانە ژێر بار، هەتا لەخۆشیانا هەر دەستی دایە خامە و نامەیەکی کتوپڕی بۆ قەشەی پیرۆز راسپۆتین نوسی، لە نامەکەی دا بانگی ئەکرد کە سەر لەماڵی بدا، چونکە نەخۆشە و خۆی ناتوانێ بچێتە خزمەتی خۆ ئەگەر وا نەبووایە خۆی ئەهات بۆ نقووم بوون لەژێر تیشکی چاوە پیرۆزەکانیا!

نامەکەی بە پەیامبەرێکا نارد، ئیتر دانیشت لەخۆشیا دەستی خۆی هەڵ ئەگلۆفت بێ گومان بوو لەوەی کە قەشە لە قسەی دەرناچێت بەوەی پلەیەکی بەرزی هەیە لەناو دەست ڕۆیشتووەکانی حکومڕانی ڕوسیای پیرۆزدا.

## موعجیزه نواندن

کۆنتێس ئەیزانی ئەم (راسپۆتین)ە چ ڕێویەکی فێڵبازە، بەڵام راسپۆتین هەر پەیامەکەی ئەوی بەدەست گەیشت، زانی کە کۆنتێس کێیە و تا چ رادەیەك دەست ڕۆیشتووە، بۆیە گەشایەوەو کەوتە خۆ بەناز فرۆشتن، هەتا ئەم ژنە لوت بەرزە بخاتە هەلەکە سەما.

خۆ بەناز فرۆشتنی راسپۆتین چەند ڕۆژێکی خایاند، هەتا ئەهات تکا کەران پتر ئەکەوتنە بەینەوە بۆ خووساندنی، تکا کەران کول و کافر بوون هەتا توانیان بەڵێنی چوونی لێوەرگرن.

بێ گومان چینی بەرز بێ پەروابوون پەیتا پەیتا ئەگەڕان بەدوای هەواڵی چۆنێتی گۆڕانی ئەم موعجیزە سەیرەی کە ڕووئەدا.

لاساریی و گێړی راسپۆتینیش سەبارەت بەم مەبەسە بوو، کە پتر پڕوپاگەندەی خۆڕایی بۆ بکرێ بۆ ڕاکێشانی سەرنجی خەڵکی چونکە ئەم تاقیکردنەوەیە ئەبێتە هۆی تەخت بوونی هەموو کۆسپێکی سەر ڕێگای بۆ گەیشتن بە ئامانجی هەر بە تاقە قەڵەمبازێ!

لە ژوانی (موعد) دانراوا، دالانی ماڵی (کۆنتێس) جمەی ئەهات بەو گوڵە بۆن خۆشە نازدارانەی کۆمەڵی بەرز لە پترس بورگ، وا (کۆنتێس) لەناوەڕاست قوفڵێکی (حلقە) تەواو لەو فریشتە نایابە ئارایش کراوانەدا لەسەر سەنگەڵییەکی نەرم و نۆڵ دانیشتووە ئەنکێنێ و ئاخ و ئۆفێتی بەجۆرێکی ناسکی ژنە شلە شارییەکانەوە!

لە ڕاستیش دا (کۆنتێس) لەدڵەوە شادمان بوو بەوەی خۆی ئەدی ئەو هەموو خەڵکە بەتەنگییەوەن، چاوەڕوانی ئەو تاقی کردنەوەیە ئەکەن کە ڕووئەدا و ئەبێتە (ویردی زمانی) سەرانسەری دانیشتوانی پایتەخت، بێ گومان ئەمە خۆی هۆیەکی گەورە بوو لە ژێرەوە کاری خۆی ئەکرد بۆ سەرسەختی ئەو تاقیکردنەوەیە کە گەورەو بچوك سەرسام ئەکا هەر

ئەمەش بوو (کۆنتێس)ی هان ئەدا کەوا پیشان بدا کە ئەمڕۆ لەڕۆژانی پێشووتر بەئازارترە هەتا ئەو کاتەی دوو لێوی هەڵئەهێنێتەوە کە بڵێ سوپاس بۆ خوا چاك بوومەوە، پتر کاریگەر تر بێ بۆ سەر دڵ و دەرونی خەڵکی وە هەتا پتر جێگەی سەرسوڕمان بێ!

میوانەکان ناوە ناوە گفتوگۆیان لەگەڵ ئەکردیا لەناو خۆیانا چەندبازیان ئەکرد چونکە خۆیان پێ ڕاگیر نەئەکرا، هەموو چاویان بڕی بووە ئەو دەرگا ڕەنگ کراوەی قەشەی خاوەن موعجیزەی لێوە دێتە ژوورەوە!

لەپڕ دەرگاوانی کۆشك مزگێنی گەیشتنی راسپۆتینی دانێ. راسپۆتین وەك حووچ لە ناوەڕاست دەرگای دالآنەکەدا ڕاوەستا، بۆ بینینی دەوری خۆی، وەك پەسپۆڕێکی کارامە کە سەری لە هەموو شتێك دەرئەچێ، پەردەیەکی بێ دەنگی خۆی کێشا بەسەر دانیشتووەکانی دالآنەکەدا، بەوێنەی خامۆشی مردووانی گۆڕستانەکان!!

کە ئەم دیمەنەی دی چاوەکانی بڕیە ئاسمان وە بەشێنەیی دەستی کرد بە هەنگاونان وەك کەسیان نەبینێ لەوانەی کەوا راهاتبوون خەڵکی و داماوان لەبەردەمیانا بلەرزن!!

لە ڕاستیا ڕدێنە چرە پڕەکەی کە بەبا پەرش و بڵاوبووبووەوە لەگەڵ کەللەی زل و بەژنی درێژو ئەو هەموو چڵکەی ڕەنگی کراسەکەی بواردبوو جێگەی سەرنج ڕاکێشان و سەرسوڕمان بوو!!

بەڵام ئەمانە هەمووی هیچ بوو بەلایەن ئەو هێزە شاراوەیەی ئەدرەوشایەوە لە چاوەکانیا بۆ وڕکردن و حوڵ کردنیان، هەر ئەوەش بوو کاری خۆی کردبووە سەر هەست ومێشکیان و هەموویانی خەو لێخستبوو بەر لە هاتنی بۆ خەو لێخستنیان!

ئەو بۆن و بەرامەیەی لە ئارەقەی لەشی بەرز ئەبووەوە لەو بۆن و

بەرامانەی ئەکرد کە لە جانەوەرە دڕندەکان بڵند ئەبێتەوە، ئا ئەم بۆنەش ئارەزووی مێیینە ئەوروژێنێ با لە ژنانی چینی بەرزیش بن، وە وا ئەباتە ناخی گیانیانەوە کە یەکی کە لەو جانەوەر و دڕندانەی خاوەنی چالاکیەکی زۆر توانایەکی لەڕادەبەدەرن، بۆیە ئەم دەور گێڕانەی بەم پێیە کارێکی تەواوی کردە ئافرەتەکان!

راسپۆتین بەپێوە چاوی ئەگێڕا بە دانیشتووەکانیا کە لەهۆش چووبوون، چاوی ئەبڕییە هەر کامێکیان ناچار ئەبوو کە چاوی داخات، هەرچەند نەترس و سەرسەختیش بووایە!!

کە لەم لایەنەوە بەتەواوی دڵی ئاوی خواردەوە، بەبێ ئەوەی دوو لێوی هەڵبێنێتەوە نزیك بووەوە لەو جێگەیەی (کۆنتێس)ی لەسەر دانیشتووە، هەرچەند کۆنتێس زۆر تەقەلای کرد دان بەخۆیا بگرێ و لەسەرخۆبێ بەڵام بێ هودە بوو!

بەبێ سڵاو یەکەن دەردوو دەسی کردبە پرسیار لێکردنی، بەدەنگێکی گڕو بەشێوەیەکی وا کە لەگەڵ ژنە هەرچی و پەرچییەکان دا گفتوگۆی پێ ئەکرد وتی:

– ئارەزووی چاك بوونەوە ئەکەی، ئەی ئافرەت؟ زۆر زۆر! ئایا باوەڕی تەواوت هەیە بەخواو بە مەسیح. ئایا ئەو باوەڕەشت لە دڵ و دەرونێکی دڵسۆزەوە هەڵ قوڵاوە!

کۆنتێس بە دەنگێکی لەرزۆکەوە بە شپرزەیی وتی:

– بەڵێ ئەی باوکە، باوەڕم هەیە.

– باوەڕیشت بە کڵێسەی ئەرسودۆکسی پیرۆز هەیە؟

– بەڵێ ئەی باوکە، باوەڕم هەیە!!

– ئایا باوەڕت بە منیش هەر هەیە ئەی ئافرەت؟

کۆنتێس سەری بۆ لەقان، نیشانەی باوەڕی، ئەم دەنگە قوڵ و وشکەی

راسپۆتین، کۆنتێسی ئەبڵەق کردبوو.

ئیتر راسپۆتین بەسەریا چەمایەوە، دوو لەپی دەستی خۆی نایە سەر شانە قەڵەوەکانی و فەرمانی دایە بەم جۆرە:

- سەیری ناو چاوم بکە.

کۆنتێس بەترسەوە گەردن کەچی خۆی بۆ نواند، راسپۆتین بۆ چەند دەقیقەیەك چاوەکانی خۆی بێ تروکاندن بڕییە ناوچاوی، بەجۆرێ ئیتر کۆنتێس ناتوانێ چاوی خۆی بجوڵێنێ، وەك چۆن چاوی مشك رائەوەشتێ لەڕاست چاوی مارا کە هێندەی نەماوە مارەکە پەلاماری بدا بۆ قووت دانی.

لێرەدا راسپۆتین چاوەکانی خۆی گەورە ئەکرد و بچوکی ئەکردنەوە هەتا پتر کاری لێبکا، وا ژنەکانی چوار دەوریان هەموو هەر سەیریان ئەکەن، لە سەرسامی خۆیان و لەترسانا چوونەتە قاوغەکەی خۆیانەوە، ورتەیان لەخۆیان بڕیوە.

بێ گومان راسپۆتین هەستی بەوە کردبوو کە پاشەڕۆی روونی خۆی بەستراوەتەوە بەم چەن دەقیقەیەوە، بۆیە هەر هێزو توانای خۆی ئەگوشی بۆ کارکردن لەو بەسەزمانە داماوە، هەتا بگاتە چاکترین ئەنجامێك، پاشان کەوتەوە قسە بەم جۆرە:

- ئەمەوێ چاك بێتەوە، ئەمە خواستی منە، ئەبێ جێبەجێ ی بکەی، تێ گەیشتی، ئەمە ئیرادەی منە، بەناوی خواو بەناوی کڵێسەی پیرۆزەوە رێگەی یاخی بوون و دەرچوون و سەرکەشی لە ئیرادەم بە هیچ جۆرێك نیە، وا پێت ئەڵێم کە ئەبێ هەر چاك بیتەوە لە نەخۆشیەکەت، وە لەمەولا هەست بە ئێش و ئازار نەکەی، تۆ کەمەندکێشی منی، کۆیلەی منی، ملکەچ و گردنکەچی منی، لەقسەم دەرنەچی، ئەی ئافرەت، وا تۆ چاك بویتەوە.

ئەو دەرگاوانەی کە پێشان بەمۆنێکەوە لە راسپۆتین مۆڕئەبووەوە، لەکاتی هاتنە ژوورەوەکەی راسپۆتینا، وا ئێستا زمانی بەستراوە گۆ ناکا وەك ئافرەتەکان کە لەدەوروپشتی راسپۆتین سەیری دیمەنی ئەم کارەساتە سەیرە ئەکەن!

دواجار موعجیزە سەری پێ گیرا، بەوەی کۆنتێس، دەست بەجێ لە جێگەکەی خۆی ڕاست بووەوە و هەڵسایە سەرپێ، وەك هێزێکی گەورە ڕای کێشێ و بەرزی کاتەوە، دەسی کرد بەگەڕان بەناو دالانەکەدا وەك بووکە شوشەی بە جەڕو قوڕمیش ئەڕۆیشت بەرێوە!

کۆنتێس لەخۆشیانا ئەم و ئەوی ماچ ئەکرد و ئەی وت:

– بەتەواوی چاك بوومەوە، ئازار لە لەشما نەماوە!

لە ڕاستیش دا هەستی بە هیچ ئازارێك نە ئەکرد چونکە نوست بوو بەخەو لێکەوتنێکی موگناتیسی بەهێز، کە کۆنتێس بە خۆی نە ئەزانی، هەروەك چۆن دانیشتووەکانیش ئەمەیان نە ئەزانی، هەموویان ئەوەی کە ئەیانبینی و ئەیانزانی ئەوە بوو کە وا ئێستا کۆنتێس چاك بۆتەوە، ئەو کۆنتێسە نەخۆشەی کە هەموو پزیشك و شارەزایان لەدەست نەخۆشەکەی کۆڵیان دابوو، بۆیە ئافرەتەکان هەموویان بەجارێ بەچاوی خاوەن موعجیزە سەیریان ئەکرد، وە چەند ئافرەتێکیان بەچۆکا چەمانەوە وەك چۆن مرۆڤ کڕنوش ئەبا بۆ پیاو چاکێ یان مۆمدانێکی پیرۆز!!

بەم جۆرە پاڵەوانی گەورە بەدەوری خۆی هەڵسا، پاشان گوێی بەهیچیان نەدا و بەکەش و فشێکەوە ڕووی کردە دەرگاکە و بۆی دەرچوو!

کە راسپۆتین لەچاو گووم بوو، ئەو ژنانەی ماوەیەك بوو دەمیان بووبووە تەڵەی تەقیو لەپڕ بەیەکا ورووژان، دەوری خاوەنماڵیان دا، ئەو ژنەی کرابووە کەرەسەی موعجیزە سەرکەوتووەکە، پەیتا پەیتا پرسیاریان ئەکرد بەگڕیا بۆ تێگەیشتن لە چۆنێتی هەستی لەکاتی بەسەرهاتەکەدا!.

هێشتا کۆنتێس لەژێر ڕکێفی خەو لێکەوتنەکەیا بەئاگا نەهاتبوو هەر چاوەکانی خۆی هەڵ ئەگلۆفت بە دەستەکانی، وەك لە خەوبینینێکی قوڵ داچڵەکی بێ بەو جۆرە تەنگەتاو بووبوو، هەروەکو هێشتا چاوەکانی لە ژێرچاو تێبڕینی چاوە تیژەکانی راسپۆتین دا بێت!

دواجار بە دەنگێکی نوساوەوە وتی:

– بەڕاستی ئەمە جێگەی سەرسوڕمانە ... بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا وا ڕووی دا (ئێش و ئازار بە تەواوی هەمووی باری کرد ئەی خۆشەویستە وردیلەکانم، باوەڕم پێ بکەن کە یەکدگیربوونی چاو لەگەڵ چاوی ئەو باوکە پیرۆزەدا شتێکی سامناکە، پێویستی بە ئازایەتیەکی زۆرە!).

ئەمە لەکاتێك دا هەتا ئەندامێك نیە لە لیژنەی کاهنەکانی ئەم کڵێسەیەدا، ئای کە ڕاستی چەند دوورە لە مێشکی خەڵکەوە، چونکە نە ئەچووە مێشکی کەسەوە کە بەڕاستی ئەمە هەر فڕی بەسەر قەشەیەتیەوە نەبووە و نیە.

لەهەمان کاتیش دا لە بەرژەوەندی کڵێسەش نەبوو کە پەرچی ئەو بەرەکەتە بداتەوە کە خوا بەسەریانا دای باراندووە، کڵێسە چۆن پشت لەکەسێك ئەکا بەبێ ماندوو بوون سامانێکی بێ وێنەبێ بۆ لیژنە!

لە ڕاستیش دا لەمێژە راسپۆتین بەدوای چۆنێتی گرتنی ئەم کەلەبەرەدا وێڵە، بەنیازی داکوتانی دەسەڵاتی خۆی، بۆ ئەمەش پێویستی بە باوەڕ پێکردنی ڕەسمی کڵێسە و دەوڵەت بوو.

راسپۆتین لەم ماوەیەدا گورج و گۆڵیەکی زۆر هەبوو، لەمماڵەوە ئەچوو بۆ ئەو ماڵ هەتا ئێوارەیەکیان چوو بۆ ماڵی (کۆنتێس ئەجناتیف) کە لەو سەردەمەدا دالانی ماڵەکەی جێگەی دانیشتنی نەك هەر ڕۆڵەکانی چینی بەرز بوو، بەڵکو فەرمانبەرە میریەکان و پیاوە ئاینیەکانی ئەرسۆدۆکسیش و قەشەکان هەر لەوێ کۆ ئەبوونەوە.

راسپۆتین لەم شوێنەدا ڕیشی بوو بەڕیشی ئەسقەف (تیوفان)ەوە بەوەی راسپۆتین ئەیزانی ئەم ئەسقەفە گەورەیە دەسەلاتێکی بێ پایانی هەیە لەکاروباری کلێسەدا بەگورجی فیزی خۆی فڕێ دایە لاوە، بەبێ دوو دڵی لەبەردەمیا بەچۆکا هات و بەوپەڕی گەردن کەچیەوە لەبەرچاوی ئەو حەشامەتە نیشانەی ڕێزگرتنی لە ئەسقەفی پایە بەرز بەبێ چەندو چوون!!

شتێکی سروشتی‌یە کە ئەسقەف زۆر شادومان بوو بەو ڕێز لێنانەی کە لەگەڵ فیزی ئەوا ئەگونجێ، دان نانی ئەم بەگەورەیی راسپۆتینا، کەوا ئێستا ملکەچی خۆی ئەنوێنێ لە ئاستیا بەڵگەی پایە بەرزی خۆیەتی، لەبەرئەوە ئەویش دەستی راسپۆتینی گرت و هەڵیسانەوە، پاشان ناو دەمیشی ماچ کردو ڕووی لە دانیشتووەکان کرد کە بریتی بوون لە ژن و پیاو بە دەنگێکی گڕی نێرانەوە وتی:

– ئەمە پیرۆزترین پیاوێکە لەژیانا چاوم پێی کەوتبێ، شایانی ئەوەیە کە باوەڕی تەواوی خۆتانی بدەنێ چونکە ئەم پیاوە هەڵبژاردەی دەستی خوایە.

بەمە راسپۆتین گەیشتە یەکێ لە ئاواتە گرنگەکانی خۆی کە ئەویش باوەڕ پێکردنێکی ئاشکرای ئەسقەف بوو کە نوێنەری ڕاستەقینەی کلێسەی ئەرسۆدۆکسی‌یە. ئا بەمە گورزی گرانی خۆی وەشاند، بۆ تەخت کردنی دوا کۆسپێ کە تەگەرە بخاتەوە لەو ڕێگە چەوتەی گرتوویەتی بۆ ئابڕووبردنی ناموسی ئەو ژنە خانەدانانە لەچنگ گورگی برسی کە راسپۆتین پیاوی هەڵبژاردەی خوایە!

## گەورەی کەنیزەکەکانی کۆشکی قەیسەر

ئەم پڕوپاگەندە ڕەسمی‌یەی ئەسقەف تیوفان کارێکی بێ پایانی کردە سەر (ئانا) گەورەی هەڵسوڕاندنی ئیشوکاری کەنیزەکەکانی کۆشکی

قەیسەری بەوەی ئەویش لەوێ بوو، وە گوێی لەو پیا هەڵخوێندنە پیرۆزە بوو کە لە دەمی ئەسقەف ئەباریێ، ئەم وشانەی ئەسقف ئەو گەرایەی لە دڵی ئانادا جێگیربوو بوو ڕۆژەکەی کۆنتێسی نەخۆشی تیا چاك بووەوە، گەورە بوو، بۆیە ئانا هەستی بە ئێش و ئازارێکی کتوپڕی سەیر کرد کە هەتا خۆشی نەیئەزانی لە چ گۆشەیەکی لەشیا ئەو ئازارە ئەزریکێنێ!!

دڵخۆشی خۆی بەوە دایەوە کە بەرەو لاوازی ئەچێت، ئەمە لەکاتێك دا جێ نەبوو گۆشتی تێکا لەبەر قەڵەوی!

گرنگ ئەمە نیە، ئەوەی گرنگ بێ ئەوە بوو بڕیاری دابوو کە چاك بوونەوەی لەم نەخۆشیە درۆزنەی ئەبێ بە دەستە پیرۆزەکانی بابە ڕاسپۆتین بێت!

ڕاسپۆتین سروشتی بزوتنەوەی خۆی لەگەڵ ئەم جۆرە ژنانەدا نەگۆڕی، هەر وەك جاری جارانی دەسی کردەوە بە خۆ بەناز فرۆشتن، هەتا پتر ئانا بخروشێنێ وە هەتا زیاتر بیخاتە هەلەکە سەما، هیچ شتێك بەلای ژنەوە لەوە گرانتر نیە کە بێزوو بەشتی بکا و دەمی نەی گاتێ!

لەم لایەنەوە ڕاسپۆتین بەهەڵە نەچووبوو، کە ئانا دەستی شت لەوەی ڕاسپۆتین بێزی نایە بێ بوڵای، بە هەڵەداوان خۆی چوو بەردەرگای لێ گرت، دای لە دەرگایماڵەکەی ڕاسپۆتین، ڕاسپۆتینیش بە ناشرینترین شێوە پێشوازی لێکرد بەجۆرێك لەتەکیا جوڵایەیەوە هیچ نرخێکی بۆ نەهێشتەوە.

ئەم پێشوازیە ئەوەندەی تر ژنەی شێتگیر تر کرد، ئەویش بە خۆهاویشتنە ناو داوی ڕاهبی پاشڵ تەڕەوە!

دواجار لەپاش هاتوچۆیەکی چەند جاری بێ سود، ڕاسپۆتین نەرم بوو بەرانبەر هەنسك و فرمێسك ڕشتن و لالآنەوەیا، دڵی خۆش کرد بەوەی دەردی دەرمان ئەکا، کە دوو بەدوو کەسیان لانەما دەرگایان لەسەرخۆیان

داخست، (ئانا) بەچۆکا هات و خۆی دا بەسەر پێڵاوەکانیا، دەستەکانی قەشـەی گرتـە نـاو ئـەو دەسـتە خرپنـە سـپی‌یانەیەوە کـە بـە بـازنگ و ئەموستیلە رازابووەوە، کەوتە ماچ کردنی بێ ئەوەی گوێ بداتە ئەو چڵك و کرێشـانەی بـە دەسـتەکانی قەشـە و نـاو نینۆکەکانیـەوە قەتماغـەیان بەستووە.

راسپۆتین گوێ بەم هەموو خۆ تێهەڵ سوونانە نەدا، بەڵکو دەستی کرد بە سەرزەنشتی کردنی بە توندی بەوەی کە چەند بێ مێشك و کەم بڕوایە، بۆیە لەناکاوا ساویلکانە کەوتە ناو ئەو تۆڕەوە کە بۆی نابووەوە، ئەویش بـەوەی کەوتـە بزرکانـدنی رابـواردنی لەگـەڵ ئـەم و ئـەودا، وا ئێسـتا فرمێسکی پەشیمانی هەڵئەرێژێ، وەکو ئەزانین فرمێسك رشتن بۆ ئافرەت کـارێکی بـەتین ئەکاتـە سـەر ئـافرەت، هـیچ ئافرەتێـك نیـە بـە هەڵرشتنی فرمێسکێکی زۆر دڵی گوشراوی کەمێك ئاسودە نەبێت، هەرچەند پەژارەی ئـازاراوی بێـت، بۆیـە جـێ‌ی سەرسـوڕمان نیـە فینگـە فینگـی گریـان و هەنسکی ئانا بێ هودە نەبوو.

لێرەدا قەشە دڵ نەرمی نواند بەوەی دەستەکانی درێژ کرد بۆ باڵی ئانا و هەڵیسـانە سـەرپێ، لـە پاداشی ئـەو هـەموو پەشیمانیەی دەری بڕی بۆ یەزدان و بۆ پیاوی هەڵبژاردەی خوا، واتە راسپۆتینی نەگریس!

ئیتر لەسەر نەریتی سەرکەوتووانەی خۆی، چاوی بڕیـە دوو چاوی ئانا بەو چاو تێبڕینە بۆ ناو گلێنـەی چاوە جوانەکانی، ئافرەتە لەهۆش خـۆی چوو، چونکە هەر لەسەرەتای هاتنیەوە خەو دای گرتبوو، بەوەی ئەوەنـدە بەجۆش بوو بۆ دامرکانەوەی ئاگری ئارەزووی.

بۆیـە وەك هێزێکـی گـەورە رای بکێشـێ، ئانـا خـۆی هاویشـتە نـاو باوەشـی‌یەوە. هـەر بەشـێوەی ژنـە جوتیـارێکی سـوکی سـیبیریا، یـا دەعبایـەکی خـۆفرۆش، کـە دەربەسـت بـە هـیچ نیـە، دامرکانـەوەی گـڕی

ئارەزووی لێ دەرکەی.

کە لە بێهۆشیەکەی داچڵەکی سەری سوڕما کە چۆن وا بە ئاسانی ئەمە قەوما بەبێ چەند و چوون، نەك هەر هەستی بەوەکرد کە خۆی ئارەزوومەندی ئەم ڕابواردنەیە، ئەگەرچی ئەم لاری لەم کەتنەی نەبوو، لەگەڵ ئەوەش دا دەسی کرد بە هەڵڕشتنی فرمێسکی قەوی قەوی بۆ ئەو لەکەیەی پێوەی نوسا.

لێرەدا دەرفەت کەوتە دەست راسپۆتین بۆ داهێنانەوەی گورزی گرانی بۆ ڕاست کردنەوەی ئەم چەوتیە، بە دەنگێکی سروستی ڕێك و ڕەوان ئەی وت:

– خۆشی ئاسمان بە هەڵەی پەشیمانێ سەد هێندەی خۆشی کەسێ کە لە ژیانیا وە لە خواپەرستی دا هەڵەی نەکردبێ و لە گوێز ساختربێ!

پاشان کەوتە هاش و هووش بۆ دڵدانەوەی بەو شتانەی کە دوورە لەگەورەیی خوا، وا دیار بوو ژنەش ئەیزانی ئەم ڕیس و گوریسە بە ئارەزووی دڵی ئەو ئەڕێسرێ، بۆیە لەدڵەوە پێی خۆش بوو، وە قەشە کۆتایی بە قسەکانی بەم جۆرە هانی:

– ئەبێ لەخۆشیانا هەڵپەڕی نەك پەژارە داوبگرێ، چونکە پەشیمانیت لەم هەڵەیە بەسە بۆ شوشتنەوەی سەد هێندە تاوان، لەبەرئەوەئەبێ شادمان بی، بەوەی ئەگەر ئەم تاوانە نەبوایە، بەرەکەتی ئەم پەشیمانیەت دەستگیر نەئەبوو، دیسان بێ بەش ئەبووی لەو خێرەی خوا دای ئەبارێنێ بەسەرتا، کە سەد ئەوەندەی خێری نوێژکردنە!

گوناهی هەڵەکەرێ:ی سەرپێیی چیە لەپارسەنگی ئەو بەرەکەتەی بەسەرتا دائەبارێ بە پەشیمان بوونەوەت؟

لەبەرئەوە ئەبێ ئەم کاری خێرە بە دەروویەکی خوایی دابنێین بۆ خۆمان نەك بە ماڵوێرانی، بە بەرەکەت نەك بە لەکە، وە پێویستە بەردەوام

بین لەسەری ئەوەندەی بۆمان بلویّ هەتا پتر بەشداری ڕەحمەتی خواپین، چونکە هەڵەکردن و پاشان پەشیمای ڕێگای ڕزگاربوون و پاك بوونەوەیە هەرچەندە نوقمی کاری خێرپین بۆ مژینی بەری خۆشی، ئەوەندە خێرمان بۆ بار ئەکریّ بە پەشیمانیمان، کەواتە دڵخۆش بە، پەژارە نەوگرێت ئەی گوڵە بۆن خۆشەکەم!

ژنە بەخۆشی کەوتەوەو پەژارەی نەما، نەك هەر ئەمە بەڵکو لە راسپۆتین ئەپاڕایەوە کە پتر بەشداری کاری خێر بیّ لەگەڵیا وە بیّ بەشی نەکا لەو خێرە بەرەکەتە، راسپۆتین دەستی بەرزکردەوە بۆ بان سەری وەك یەکیّ چاوەڕیّی الهام یا وەحی بکا بە دەنگێکی گڕی قەبەوە بە ژنەی وت:

- بەناز و نیعمەتی گەورە گەیشتی ئەی ئافرەت، وا تۆ هەڵبژێرای کە ببیتە یەکیّ لە (ژنە گیانی)یەکانم، بەوەی نیشانەی زرنگی و لێبوردن و خۆشەویستی خێروبەرەکەت لە چاوەکانتا ئەخوێنمەوە، وا ئەم پایە بەرزەت پیّ بەخشرا، بەگوێرەی ماندووبوون و توانات، جێگای بڵندی خۆت ئەگری لە مەملەکەتی گیانی دا.

هیچ گومان لەوەدا نیە کە (ئانا) هەستی بە خۆشیەکی لە ڕادەبەدەری ئەکرد ئەو کاتەی راسپۆتین گرتبوویە باوەش لەناو ئەو دوو بازووە پۆڵاییانەی خۆیا، خۆشیەك کە لەوەوبەر نەی چێشتبوو لە باوەشی دۆست و مێردە کۆنەکانیا، لەبەرئەوە شاگەشکە بوو بەوەی چۆتە ڕیزی ژنە گیانیەکانی راسپۆتینەوە!

سەرسوڕمان و سەیر لەوەدا بوو کە ئەم کردەوە جانەوەریانەیان بە شێوەیەکی نویّی جاویدانی دابووە پێنوس، خۆشیان بەوە فریوو دابوو کە ئەمە فەلسەفە و اجتهادێکی نویّیە لە جاویدانی و گیان پاککردنەوە، کە ئەمە تا ڕێگای چونە بەهەشت و لێبوردنی خوایییە!

هێندی ئافرەت دڵداری خۆی فریوو نادا، بۆیە (ئانا) کردیە ئەرکی

سەرشانی کە نابێ لە مێردە گیانیەکەی، واتە راسپۆتین دابڕێ، وە ئەبێ هەمیشە بەهانایەوە بێت، ئەوەندەی لەتوانایا بێ و بۆی هەڵسوڕێت بۆ وەرگرتنی بەشی خۆی لە (ڕابواردن و جاویدانی، کە هەتا تەوقە سەریشی تیا نوقم بووە!

ئانا لەوە زرنگتر بوو ئەم پەیوەندیەی بە راسپۆتینەوە لای کەس بدرکێنێ، هەموو جارێك بیانویەکی بۆ خۆی ئەدۆزیەوە، بۆ چاك بوونەوەی لە نەخۆشی لاوازی کە نیشانەکانی لێ بەدەرکەوتبوو کە بریتیە لە بێ خەوی و ئارەزووی خواردن و خواردنەوە نەکردن، کە لە راستی دا بەزۆری ئەمانە نیشانەی ماندووبوونی جگەرەیەو بەهۆی زۆر خۆری خواردەمەنی چەورەوەیە.

لە هەموو سەردانێکیا، راسپۆتین توانای خۆی بەخت ئەکرد بە چاو برینە دوو چاوی بۆ نواندنی بەشێوەیەکی موگناتیسی تەواو، پاش خەو لێخستنی، ئەهاتە وێزەی بە ئارەزووی خۆی بەبێ تەریق بوونەوە، بەجۆرێك لە هەموو سنورێکی شەرم ئەچووە دەرەوە.

هەتا لە ئەنجاما پەیوەندی ئانا بە راسپۆتینەوە گەیشتە رادەیەك کە ئانا بەبێ راسپۆتین نە ئەژیا، جڵەوی لەدەست خۆیا نەمابوو، کەوتبووە دەست راسپۆتین بەڕادەیەك کە شەرەف و نەریتی کۆمەڵایەتی و لۆراو یاسا ئەمانە بەسەریەکەوە هەمووی لەلای ئانا بووبووە پووش و برنج، هەتا پەیوەندی دایکایەتی ئەو بۆ منداڵەکانی و پەیوەندی خێزانی نەیان ئەتوانی ببنە کۆسپ لەرێگەی سەر شۆڕنەکردنیا بۆ ئارەزووی جانەوەرانەی خۆی.

سەرسامی لەوەدا بوو کە ئەم ئاڵۆشەی بە شتێکی سروشتی ئەخستە پێش چاوی خۆی، کەچی هەموو نرخ و بایەخێکی (ئانا)ش بەلای راسپۆتینەوە هەر ئەوە بوو کە کلیلی کردنەوەی دەروازەیماڵی قەیسەرە،

واته دوا ئامانجی.

بەم جۆرە راسپۆتین توانای خۆی داسەپان بەسەر (ئانا)دا، ئایا ئێستا لە ئامانجی هەرە دووری نزیك بۆتەوە؟ وە ئایا ئەتوانێ ئێستا ئەم کلیلە زێرینە بەکاربێنێ؟ وە ئایا ڕێگای چوونە ناو کۆشکی قەیسەریشی وەك تەخت بوونی ئەو ڕێگایانە سوك و ئاسان دێ بەدەستەوە یان نا؟

لە پارچەکانی تری ئەم چیرۆکەدا چاومان بەو پرۆژە تازەیەشی ئەکەوێت.

*************************

راسپۆتین و ئانا لەیەك ئەچوون، بۆیە وا بەئاسانی لەیەك ئالان، ئارەزووی دوو کەس ئەبێتە هۆی بەتین کردنی پەیوەندی نێوانیان، بەتایبەتی ئەگەر بەرژەوەندی و دەسکەوت و سودی ئەم دووانە لەیەکەوە زۆر نزیك بوو.

ئەوەتا (ئانا) سەرەڕای پایەو شوێنی لەناو کۆشکی قەیسەریدا هێشتا هەستی بەوە ئەکرد کە مێینەیە و مێینەش بەدەست خۆی نیە هەست بە بودەڵەیی خۆی ئەکا ئەزانی کە پێویستی بە پاڵپشتێکی نێرینە هەیە کە سوێند خۆری بێ، سوێن خۆرێکی بەهێزو نەترس بێ، بە راسپۆتینا ڕا ئەپەرموو کە ئەو سوێند خۆرە بێ وێنە لێوەشاوەیە بێ کە بەدوایا ئەگەڕێ، بۆ سەرپێ گرتنی ئەو نەخشەو پیلانانەی ئەیەوێ سەریان پێ بگرێ لەناو کۆشکی قەیسەردا!

تەخت کردنی کۆسپی هەرە گەورە و سەخت لای (ئانا) ئەوە بوو کە بەهەر نرخێك بێ راسپۆتین بگەێنێتە ناو کۆشکی قەیسەری و بیکا بەیەکێ لە پیاوانی ناو کۆشك، ئەم جۆرە کۆسپانەش خۆیان ناگرن لەبەردەم خواست و ارادەی ژنێکی نەهەنگی وەك ئانادا، بۆیە ئانا قۆڵی لێ هەڵمالی بۆ دامەزراندنی راسپۆتین لە کۆشکی قەیسەردا، وە لەو

کاتەوە کە ئانا بۆتە یەکێ لە ژنە گیانیەکانی راسپۆتین، پێی لە ماڵی راسپۆتین نەبڕیوە بۆ هەڵسان بە پێویستی ژن و مێردایەتی تایبەتی گیانیان!

بەڵام راسپۆتین لەوماوەیەدا بە ساردیێکەوە لە ئانا نزیک ئەبووەوە، ئەگەرچی لەڕاستیشا شاگەشکە بوو بوو بەم نێچیرە قەڵەوە بەنرخە، بەوەی ئەیزانی چەند دەست ڕۆیشتووە لای قەراڵیچە شابانوی ڕوسیا کە حوکمڕانی ڕاستەقینەی ڕوسیا هەر ئەو بوو نەك قەیسەر، راز و نهێنیەك نەبوو کە شابانو گوێ بۆ ئامۆژگاریەکانی (ئانا) شل نەکا!

راسپۆتین ئەیویست لە ڕاست و دروستی (ئانا) دڵنیابێ، کە ئایا ڕاستە بەدڵ و بەگیان لەگەڵیایە، بەر لەوەی گورزی گرانی خۆی بوەشێنێ، بۆ ئەم نیازەش (ئانا)ی خستبووە ژێر تاقیکردنەوەیەکی سەختەوە، لە شێوەی ئەو تاقیکردنەوەیە ئەچێ کە بەکار ئەبرێ لە یاسای ماسۆنیەکان دا بۆ ئەوانەی ئەیان هێننە ڕیزی خۆیانەوە.

بۆیە هەر لەخۆیەوە لە هیچە دەری ئەکرد یا پێشوازی نەئەکرد، وە یا هەتا دەرگای لێ نەئەکردەوە، وە یا جارجارەش دەرگای ئەدا بەیەکا لەڕوویا و بەجنێو ئەهاتە وێزەی، بەبێ ئەوەی (ئانا) هەڵەیەك یا تاوانێکی کردبێ!

کەچی ئەم دڵدارە سوتاوە واتە (ئانا) بەم هەموو ڕەزالەتەی ئەو قایل بوو بەدەم قوڵپی گریانەوە ئەگەڕایەوە لای و تۆبەو فرمێسکی پەشیمانی هەڵئەڕشت لە گوناهێك کە نەی کردووە و هەر ئاگاشی لێی نیە!

کە داوای پارەی لێ ئەکرد، دەست بەجێ بۆی هەڵئەسوڕاند تاکو وای لێهات خشڵە گرانبەهاکانی بۆ بەخت بکا، وە هەر ئەوەبوو هۆی ئابڕوو چوونی لە ئەنجام دا.

دوای ئەمانە، سەری کردە سەر ئانا، بۆ درکاندنی نهێنیە گرنگەکانی

دەوڵەتی و پیلانەکانی پۆلیسی نهێنی و پێنوسی نهێنی (القلم السری) کە بێ گومان ئانا، ئاگای لە هەموو شتێکیان هەبوو، ئەویش بەبێ دوو دڵی چی بویستایە ئاگاداری ئەکرد، بۆ ئەوەی دڵی ئاوبخواتەوە، دەست نوسی ئەو هەواڵانەی گرنگ بوونایە بەدەم بۆی ئەگێڕایەوە، یا لەگەڵ خۆیا بۆی ئەهانی، لەگەڵ باس و خواسی ئەو چەکی پارانەی بە دەسیا و بەسەر پیاوانی گەورەی دەوڵەتەوەن، کە بەدرکاندنی سەری نووکە دەرزیەك لەو نهێنیانە خاوەنەکانیان ئەبنە پەنگ.

ئا لەم ڕێگەتووش و شەختەوە دڵسۆزی (ئانا)ی تاقی کردەوە، بەوەی کە بەدڵ و گیان لەتەکیایە، ئەویش لە پاداشا بەڕاستی کردیە یەکە ژنی گیانی خۆی و دۆستی هەرە لەپێشی، دەسەڵاتی توانای راسپۆتین بەڕادەیەك کاری لێ کردبوو، بە تیلە چاوێك لە هۆش خۆی بچێ لەترسانا.

جگە لەمە (ئانا)زۆر پەرۆش بوو، بە گەیاندنی مێردە گیانیەکەی، واتە راسپۆتین بۆ ناو جەرگەی جەنگەڵی کۆشکی قەیسەری بۆ تێکشکاندنی ئەو دڕندانەی ئەو بێشەڵانەیان کردبووە مەیدانی پیلان و تۆڕنانەوە، بەو نیازەی ببێتە پاڵپشتی هێز و دەسەڵاتی بێوێنەی.

ئانا، ئەیزانی کە ژنێکی نەفام و مومتەلا بە نەخۆشی هیستری وەك قەڕاڵیچە شابانو نێچیرێکی قەڵەوە بۆ ڕاوکردن و رام کردنی، هەروەها بۆ هێنانە ژێرباری توانای دەسەڵاتی لەڕادەبەدەری راسپۆتینەوە، لەڕێگای خەو لێخستنیەوە.

لە ڕاستیشا قەڕاڵیچە (ئەلکسندەرا) باوەڕی بە جادوگەری هەبوو، بەوەی لەقولایی دڵیەوە هەر لەسەر سروشتی نەژادی جەرمەنی خۆی ئەڕۆیشت، جەرمەنەکان بەرەیەکن هەر لە کۆنەوە دەستێکی بالایان هەبووە لە جادوگەری و ئەفسانەدا.

شابانو ئافرەتێکی ساویلکە بوو هەر لە مندالی ڕقن و مانگرو

سەرسەخت ئەچوو، هەمیشە دڵ کرمی و ترسنۆك بوو، مەترسی ئەوەی هەبوو ڕۆژێك لە ڕۆژان پلانێکی وێڵ و بەدزی ئایاریا بەسەر پایاریانەوە نەهێڵێ!

ئەم ترسنۆکی‌یە لە زووەوە چوو بووە دڵ و دەرونیەوە، لە هەستی شاراوەیەوە هەڵ ئەقوڵا، بەوەی دوژمنایەتی پەنگ خوراوەی خەڵکی، هەر ڕۆژێك دێ بتەقێتەوە بەسەریانا، وەك بۆ دوایی هاتە دی لەسەر دەستی شۆڕش گێڕەکانیا.

دیارە ئەم دوو دڵی و ئۆقرە نەگرتنەی هۆیەك بوو پاڵی پێوە ئەنا بۆ خۆبەستنەوە بە بیرو باوەڕی ئاینیەوە، بەو نیازەی کە خوای گەورە بە هانایەوە بێ لە تەنگانەدا، هەر ئەمەش بووبووە هۆی باوەڕکردنی بە چارەڕەشی خۆی!

بەکورتی ئافرەتێکی نیمچە شێت و بێ ئیرادەی ڕاڕای دڵ ناسك و دەماراوی بوو.

ئا لەم کاتەدا بوو کە کوڕی قەیسەر دووچاری نەخۆشی دەماربوو، بەجۆرێك کە شارەزایان و پزیشکەکانی ئەو سەردەمە هەموو شپرزە بووبوون بە دەست چۆنێتی چارەکردنیەوە، هەتا هاتنە سەر ئەوەی کە ئەبێ دەست لە ژیانی بشۆرێت لەگەڵ ئەوەشا نەیان ئەوێرا دەری بڕن کە ئەم نەخۆشی یە میراتێکی زکماکی‌یە لە دایکی‌یەوە بۆی ماوەتەوە بەوەی ژنێکی دەمار لاوازە.

نەخۆشی ئەم کوڕە وەك چەخماخەیەك بوو کەوت بەسەر شابانودا، کە لەبەرئەو بەتەواوی ژیانی لێ تاڵ بوبوو، هەر ئەوەندە نەبوو شێت نەبێ لە غەم و پەژارەی ئەوا، بۆیە ئامادەبوو بۆ قایل بوون بە هەموو جۆرە مەرج و پێشنیارێك کە تروسکەی ڕوناکی هیوای چاك بوونەوەی کوڕەکەی بگەشێنێتەوە، بەتایبەتی کە ئەم ڕێگەی چاك بوونەوەیەش پەیوەندی بە

جیهانی شاراوەو نەبینراوەوە هەبێ کە لەگەڵ سروشتی ئەوا ئەگونجێ، ئەمە لەکاتێکا شارەزایان هەموو نابووت بوونی خۆیان دەربڕی بوو دەربارەی چاك بوونەوەی نەخۆشی کوڕەکەی لەڕێگای زانیاری ئەمانەوە.

بۆیە (ئانا) پێویستی بەزمان لوسییەکی زۆر نەبوو بۆ فریوودانی قەرالیچە، بەوەی راسپۆتین خاوەنی موعجیزە، پیاوی هەڵبژاردەی خوا بەتەنها ئەو ئەتوانێ کوڕەکەی بۆ بکاتەوە بە گوێزی ساخ.

**هاتنی راسپۆتین بۆسەر جێگای جێنشین**

هەر ئەوەندەی ئەم پێشنیارە لە دەمی (ئانا) دەرپەڕی، یەکسەر قەرالیچە پێنوسی گرت بەدەستەوە بۆ نامەنوسین بۆ راسپۆتین، داوای هاتنی ئەکرد بۆ کۆشکی قەیسەری بەنیازی چاك کردنەوەی جێنشینی نەخۆش بە هیمەت و بەرەکەتی لەرادەبەدەریەوە، ئانا خۆی پالاوت بۆ ئەوەی کە خۆی نامەکەی قەرالیچە بەرێ بۆ راسپۆتین.

بەم جۆرە ئێوارەیەکیان (ئانا) گەیشتە لای دۆستە سیبیریاییەکەی کە راسپۆتینە، بە ڕوویەکی خۆشەوە، هەر بە گەیشتنی ئانا بەلای راسپۆتین، ئانا دەستی درێژکرد ئەو پەیامەی دەست نوسی قەرالیچە بوو دای بەدەست راسپۆتینەوە، ئەو نامەیەی کە گەلێ لە پیاوە خانەدانەکان و دەوڵەمەندەکان بۆ تەنها دیڕێکی گەردنی خۆیان ئەشکاند.

ئەی ئەبێ هەڵوێستی راسپۆتین لەو پەیامە چۆن بووبێت؟

ئا لەم چرکەیەدا بە دەورێکی ئەوەندە شەیتانە هەڵیا کە ئەوپەڕی فێڵبازی بوو، هەر بە لالوتێکەوە چاوێکی بە دێڕەکانیا خشان بە گرژبوونەوە فڕێی دایە بان زەویەکە، بەهێمنی و ساردێکەوە بە دۆستەکەی وت:

–هیچ هێزو ئیرادەیەك نیە ملی خۆمی بۆ کەچ کەم لە هێز و ئیرادەی خوای نەمر بەولاوە هەرگیزا سەرۆکەکانی جیهان و خاوەن تواناکان هیچ

نرخێکیان نیه بەلای منەوە، هەر ئێستا هەڵسەو بگەڕێرەوە بۆلای قەڕاڵیچە و پێی بڵێ کە قەشە راسپۆتین پیاوی خوایە، ملکەچ ناکا بۆ فەرمانی هیچ کەسێك، چونکە هەر ملکەچ و گەردنکەچی فەرمایش و فەرموودەکانی خوایەو بەس.

بەمە هەموو لەشی (ئانا) کەوتە لەرزین و کەوتە پاڕانەوە و وتی:

- ئەمەی ئەوان بۆ تۆ فەرمان نیە ئەی پیاوی پیرۆزی خوا! بە بەزەیی خۆت، بەڵکو بەمە شابانوی بەڕێز تکات لێئەکا، تکایەکی گەرم و پڕ لەپاڕانەوە!

راسپۆتین بە لەخۆ بایی بونێکی زۆرەوە وتی:

- پاڕانەوەی شابانو هیچ نرخێکی نیە لای من، بەدرۆ وای پیشان دا کە بەهیچ جۆرێك ناچێ بۆ کۆشك.

بە ناچاری (ئانا) گەڕایەوە بۆ کۆشکی زستانە کە کۆشکی قەیسەرە لە پترس بورگ بەدڵتەنگی و پەژارەوە، ئەمە لەکاتێکا کە شابانو بەگەرمی چاوەڕوانی گەڕانەوەی ئەکا، قەڕاڵیچکەی ئاگادار کرد بەوەی سەر نەکەوت لە هەوڵ و تەلاشەکەیدا، بەمە شابانو بە توندی دەمار گرتی، وە وا لەمێشکی چەسپی کە هەر لە توانای راسپۆتین دایە، جێنشین بۆ قەڕاڵیچە چاك بکاتەوە، دیارە وا نوسراوە لەسەر بنەماڵەی قەیسەری کە تەفروتونا بن تەنها لە خولێکی نزیکا.

بۆیە شابانو کەوتە هاوار هاوار، بەدەم دەمار گرتنەوە وتی:

بۆچی پیاوی خوا گوێ لە پاڕانەوەم ناگرێ و بەهانای هاوارمەوە نایە، ئایا چ گوناهێکم کردووە، بۆ لام لێناکاتەوە، بۆ لێم تورەیە!

(ئانا) بەشەرمێکەوە پێی وت:

- لەڕاستیا ئەگەر باوەڕ ئەکەی ئەی گەورەم، کە پیاوی خوا هەرگیز باوەڕ بە دەسەلاتێك ناکا لەسەر رووی ئەم جیهانە لە دەسەلاتی خوا

بترازێ....

لێرەدا شابانو قیژانی و وتی:

– بەڵام ئەوەی لێی ئەپارێتەوە قەراڵیچە نیە، بەڵکو دایکێکی کلۆڵی بەدبەختە، تکات لێئەکەم ئەی (ئانا) کە بەگورجی هەر ئێستا بگەرێیتەوە بۆلای، هەرچی لەتواناتایە بەختی کە بۆ قایل بوون و دلْ نەرم کردنی.

(ئانا) سەری خۆی بادا بەبێ ئەوەی ورتەبکا، چونکە ئەیزانی کە راسپۆتین سەرسەختە لە قسەی خۆی پاشگەزنابێتەوە، بۆیە شابانو دەستی کرد بە پارانەوە بە چاوێکی پڕ لە فرمێسکەوە وتی:

–پێی بڵێ کە لەتوانایا هەیەو بۆی ئەلوێ داوای هەرچیەکم لێ بکا، ئامادەم بەبێ چەند و چوون بۆی بهێنمە دی، واتە ئامادەم بۆ هەر قوربانیەك ئەو بیەوێ، لەپێناوی ڕزگارکردنی ژیانی جێنشین دا، واتە کوڕە نازدارەکەم.

ئانا وەڵامی دایەوە و وتی:

–سوێندت بۆ ئەخۆم ئەی گەورەم کە هەموو توانام بەخت ئەکەم، هەوڵ و تەقەلای ئەوە ئەدەم کە (پیاوی هەڵبژاردەی خوا) لە جێی خۆی بجوڵێنم، وای لێبکەم بێت بۆ ئێرە، بەڵام مەخابن کە هەر گوێ لە دەنگی خوا ئەگرێ و بەس.

شابانو وتی:

– ئەو ڕێگەیەم پێ نیشان دە کە ئەبێ بیگرم، هەتا لێمان قایل بێ، من ئامادەم بەبێ شەند و چوون لەسەر ئامۆژگاریەکانت بڕۆم بەو ڕێگەیەدا، هەتا خوا بەزەیی پیاما دێتەوە و دڵی پیرۆزی ئەومان بۆ نەرم ئەکا، وا هەڵئەستم نوێژ ئەکەم و خۆم پاك ئەکەمەوە بە پارانەوە هەتا بەختەوەرمان بکا بە تەشریف هێنانی!

(ئانا) وتی:

- زۆر چاك ئەكەی، چونكە هەرگیز ناگونجێ پێشوازی لەو پیاوە پیرۆزە بكەی بەبێ خۆ ئامادەكردن، باوەڕت هەبێ تەنها ئەم ڕێگەیە مەگەر كاری لێبكا، چونكە بەگیان هەست بەنوێژ كردن و پەیڕەویت بە ئامۆژگاریيە ئاینیەكان ئەكا، ئەو كاتە بەزەیی ئەجولێت، منیش هەموو توانای خۆم بەخت ئەكەم بۆ كارتێكردنی.

بەر لە گەڕانەوەی ئانا بۆلای راسپۆتین قەڕالیچەی خوساند و مێشكی ئامادەكرد بۆ هەموو فرو فێلێكی ئەو!

كە (ئانا) گەیشتە لای راسپۆتین هەموو كردەوەكانی شابانوی بەبێ كەم و كورتی بۆ گێڕایەوە، بەلام راسپۆتینی فێڵ باز، شانەكانی بۆ هەڵتەكان و خۆی ڕیش گاو نەكرد وا بەئاسانی بۆ یەكەم ڕۆژ وەلامی شابانوی بداتەوە، هەولی دا كە ماوەیەك خۆ بەناز بفرۆشێ، لەخۆبایی بوونی درێژەی پێدا ئەوەندەی بۆی لوا، هەتا ئەوەی بردە مێشكی شابانووەوە كە ئەم پیاوە لەو قوڕە دروست نەكراوە كە پیاوانی تری لێ دروست كراوە، بەوەی زۆریانی هەڵ سەنگاندبوو ئەیزانی هیچ و پوچن! ئەمە جگە لەوەی كە ناكەس بەچەیەكی وەكو راسپۆتین خۆشیيەكی زۆری بەگیان ئەگەیشت بەوەی ئەتوانێ شابانوی گەورە و گران ئازار بدا و پاشان زەبوونی بكات!

بێگومان ئا لەم كاتەوە خۆی بە كەڵە پیاوی هەموو ڕوسیا دائەنا، بەوەی ورد و درشت لەبەریا بەچۆكا دێن، خۆی بەخاوەن مافتر ئەزانی لە هەڵسوڕاندنی كاروباری حوكمڕانی دا لەو بودەڵ و نەخۆش و دەردەدارانەی دەستیان گرتووە بەسەر سەرانسەری ڕوسیادا.

**شابانو**

لەو ماوەیەدا کە راسپۆتین خۆی بەناز ئەفرۆشت بە شابانو، تەندروستی جێنشین ڕوو لە خراپی بوو، لەبەر لاوازی لەجێگا دەر نەئەچوو، هەموو لەشی دابێزرابوو، هەرچی چاوی بەو بکەوتایە ئەیوت لە گیانەڵادایە، شابانوش هەتا ئەهات شێتگیر تر ئەبوو، بۆیە بێ پەروا سەری کردبووە سەر نوێژکردن و ڕۆژو گرتن بەو نیازەی خوا دڵی قەشەی پیرۆزی بۆ نەرم کا، ئەوەی لەبیر کردبوو کە خوا کەسی دا نەناوە ئاهو نزولەی ئەم و ئەوی پێ ڕاگەیێنێ، ئەوەی لەیاد کردبوو بەوەی خوا چاوی لە هەمووانەوەیە، شابانو لە پەیام ناردنی بۆ راسپۆتین ماندوو نەئەبوو، بەڵام راسپۆتین بە پێچەوانەی ئەوەوە خۆی هەڵگرتبوو بۆ کاتێکی تایبەتی.

دواجار راسپۆتین نامەیەکی ئەوتۆی بۆهات لە پاڕانەوە، ئیتر راسپۆتین هەستی کرد کە دەرفەت لەبارە بۆ دەست وەشاندن، وە بۆ گێڕانی دەوری خۆی، بۆیە بە (ئانا) دا هەواڵی نارد بۆ شابانو کە هەڵسانی بە جاویدی و باوەڕی توند و تۆڵی کسپەی لەدڵی هێناوە، لەبەرئەوە بڕیاری داوە کە سەری لێبدا!

لە کاتی دانراودا بۆ ئەم دیدەنیەی، راسپۆتین ڕووی کردە کۆشکی زستانە، خۆی کرد بە بارەگای قەیسەرە نەمرەکانا، بە هەموو فیزو لەخۆبایی بوونیەوە، وەك چۆن مرۆۆ ئەچێتە ماڵی خۆیەوە، بەو پێ و پێڵاوە گەورە ناشرینە بزمار ڕێژە ئاسناوییانەیەوە، کە لەبەر قوڕو تۆز ڕەنگی دیار نەبوو، بەشێنەیی بەسەر ئەو قاڵی و مافورە نایابانەدا پێڵاوەکانی کێش ئەکرد بەسەر ئەو ڕایەخانەی کە لەخاوێنی بەولاوە گەردیان لێ نەئەنیشت، بەناوی دوو ڕیزی دوورو درێژی دەست و پێوەندی پەری شێوەدا کە لە جلوبەرگی تایبەتی دا بوون، هەموو لەبەریا

نوشتانەوە بە فەرمانی شابانو وەك یەكێك بێت لە گراندۆقەكان یان ئەمیرێ بێ لە خانەوادەی قەیسەری!

بەڕاستی جلوبەرگی لەم دیدەنیەدا شایانی ناو بردنە، جگە لەو چلیپا گەورەیەی كە بەزنجیرێكی ئەستورەوە بەسەر سنگیا شۆڕ بووبووەوە، سیپاڵەكانی تری بەری هیچ نیشانەیەكی تری ئاینی پێوە نەبوو، كراسێكی سوری چڵكنی لەبەرا بوو، چنینەكەی زبرو نرخەكەشی هەرزان، هەر لەوانەی جوتیارە هەژارەكان لەبەریان ئەكرد لەسیبیریا ڕەنگی شەرواڵەكەشی شین باو بوو بەڵام ڕەنگەكەی لەبەر پینەو پەڕۆی لە هەمە چەشنە، بە تەواوی نە ئەناسرایەوە تەختەكەی چۆن بوو!

گەورەی كەنیزەكەكانی كۆشك، واتە ژنە گیانیەكەی (ئانا) لەپێشوازیا وەستا بوو، یاوەر بوو لەبەردەم ئەو داڵانەدا وەستا بوو كە شابانو چاوەڕوانی هاتنی راسپۆتینی لێ ئەكرد. كە راسپۆتین گەیشتە ئەو داڵانە بە جوڵانەوەیەكی پاڵەوانانە بەگورجی (ئانا)ی لەشوێنی خۆی وەستاند، بێ پەروا بێ ئەوەی تۆزی دەربەست بێ بە نەریتی پێشوازی خۆی گەیاندە ئەو شوێنەی شابانو تیا دانیشتبوو، بێ ئەوەی ماوە بدا بە یەكێ لە پیاوانی كۆشك دەرفەت بێنێ و ئاگاداری بكا لە تەشریف هێنانی پیاوی پیرۆزی خوا!

شتێكی سروشتی یە كە شابانو لەشوێنی خۆیا حەپەسا، چونكە ئەو فێری نەریتی پرۆتۆكۆڵ بوو، بەدرێژایی ژیانی هەر بەم نەریتە ئەجوڵایەوەو ئەچوو بەڕێوە، هەتا ئەو ڕۆژە كەسی نەدیبوو بەم جۆرە ئەو نەریتە بشكێنێ، لەگەڵ ئەوەشا نەیهێشت كە شابانو سەرسامی خۆی دەربڕێ، لەبەردەمیا وەك چەتوڵ بەفیزێكەوە ڕەق ڕاوەستا، چاوەكانی بڕییە دوو چاوی، دەستی كرد بە گەورە كردن و بچوك كردنەوەی چاوەكانی خۆی، تیشكی چاوەكانی وا كاری كردە دەماری لاوازی

شـابانو، بۆیـە وای بـەخۆزانی کـە راسـپوتین نـاو دڵ و دەروون و مێشـکی ئەخوێنێتەوە، وەك چۆن شمشێرێکی تیژی هەسان دراو لەبەر تیژی پەڕە کاغەزێکی تەنك ئەبڕێ!

راسپوتین بەبێ ورتە مایەوە بۆ کار لێکردنی، هەردوو چاوەکانی بڕییە دوو چاوە شینەکانی، قەرالیچە خۆی ئامادە کردبوو بۆ گەیشتن بە پیاوی هەڵبـژاردەی خـوا بـە لەبـەرکردنی کراسێکی سـادە، لەگـەڵ ئەوەشـا خـاڵی نـەبوو لـە زەوق بـەرزی، قـژە زێڕینـە جوانەکەشـی لـوول درابـوو بـە ماندوبونێکی زۆر کە بگونجێ لەگەڵ دەم و چاوی وردیلەی سحراوی یا کە دڵی لە دڵداران ئەفڕاند. بـەڵام راسـپوتینی پاشـڵ پـیس خـۆی لـەو سـیپاڵە چڵکنە هەڵکێشـابوو، ریشـە درێـژە پـەرش و بڵاوەکـەی بەسـەر سـنگیا بـژ بووبووەوە، چڵکنی و چەوری، هـەتا پاشماوەی خـواردنی بەئاشکرا پێوە شۆڕ بووبووەوە.

پاشان راسپوتین بە دەنگێکی وشکی گڕەوە شیرانی، دوای ئەوەی دڵنیا بـوو لـە هـەڵهاتنی هـەویری بـەردەمی، بـەوەی هـەڵی سـەنگاند کـە هـەتا چ رادەیەك کاری لێکردووە، وەك چۆن لەگەڵ هەرچی و پەرچییەکا ئەدوێ هەر بەو چەشنەش ئەوی ئەدوان:

– چیت لەمن ئەوێ ئەی ئافرەت.

تەزوویەك بە لەشی شابانودا هات بەم شێوەی گفتوگۆیەی کە لە هـەموو ژیانی خۆیا گوێی لێ نەبووە هەتا لە خودی قەیسەریشەوە، قەرالیچە بۆ چـەند چـرکەیەك پـەژارەو ماتـەمینی گرتـی، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـا ورتـەی نەکرد، راسپوتین شیرانییەوە بەسەریا:

– قسە بکە ئەی ئافرەت .... من بەپەلەم ئیشم هەیە...

وای پیشـان دا کـە ئەیـەوێ بـڕوا! بەناچـاری شـابانو زمـانی بـەربوو بـە منجە منجێکەوە وتی:

– ئەی باوکە .... لەپێناوی کوڕە نەخۆشەکەما بانگم کردووی.

بەبێ ئارامییەکەوە راسپۆتین کەوتە بۆڵە بۆڵ:

– لە کوێیە ئەو کوڕەت؟

شابانو بەدڵە کوتییەوە وتی:

– بۆچەند هەنگاوێك وەرە لەگەڵم.

ئیتر هێندەی نەخایان گەیشتنە جێگای جێنشین، کە لەسەر گازی پشت لەسەر قەرەوێڵەیەك درێژبوو بوو، دووان لە ژنە لەلەکانی ناو کۆشك، بەدیاریەوە بوون بۆ پێش خزمەتی، چاوە لێڵەکانی بە ئەبڵەقی کردبووە ئاسمان، هێندەی نەمابوو ڕووناکیان تیا بکوژێنەوە، ڕەنگ و ڕووی زەردی پتر لە ڕوخساری مردووی ئەکرد، نوستبوو بەلام بەچاوی کراوەوە بەوێنەی مردوویەك لەو مردووانەی تازە ئەمرن و هێشتا دەورو پشتەکەی نەیان پەرژاوە چاوەکانی دابخەنەوە!.

ئیتر راسپۆتین وەك یەکێ چاوەڕێی وەحی و الهام بکا، لە کوڕەی نەخۆش چووەبەرەوە، دوولەلەکەی لەوێ بوون بەچۆکا داهاتن لەبەریا بەوپەڕی ڕێز لێگرتنەوە بێ ئەوەی راسپۆتین هەر بێزی بێ سەیریان بکا، ئەوانیش هەر ئەوەیان بۆ کرا هەڵسان و خۆیان دزیەوە بەبێ خشپە.

راسپۆتین بەسەر منالە نەخۆشەکەدا نوشتایەوە، ئەوەی ئەزانی کە ئەبێ هەر ئێستا دەوری هەرە گەورەی لەبەردەم ئەم ژنەدا یاری بکا، بۆیە هەموو هێزو توانای خۆی لە زەبرو توندی چاوە ئاگراویەکانیا کۆکردەوە، کەوتە سەیرکردنی منالەکە، هەردوو ناولەپی دەستی خستە سەر دوو شانی نەخۆشەکە، هەتا بە خەو لێخستنی موگناتیسی کاریگەر بکا، زۆری نەخایاند ئەوەی بەدوایا وێڵ بوو هاتە دی، چونکە مێشکی منالەکە لەوە لاوازتر بوو کە پەلەقاژە بکا بەرەو مەرگ شەپۆلی ئەو هێزەی کردوویە بەگژیا.

راسپۆتین هەستی بەوە کرد منالەکە بۆتە هەویرێکی نەرم لەناو دەستیا ئەتوانێ بە ئارەزووی خۆی بیبا بەڕێوە، فەرمانی پێدا فەرمانێکی گیانی بێ ئەوەی ورتە لە لێوی بەرزبێتەوە، فەرمانی دایە کە زەردەخەنە و خۆشی بنوێنێ، منالەکە ئەو فەرمانەی ئەوی بێ چەند و چوون جێبەجێ کرد، ئەو فەرمانەی کە ڕاوەستاوەکانی نزیکیانەوە گویان لە هیچیەوە نەبوو، کەچی کوڕە بە شێوەیەکی ڕێك و پێك لەسەر خواستی راسپۆتین ئەڕۆیشت بەڕێوە.

وا شابانوش بەژوور سەری کوڕەوە بە دووچاوی سەری سەیری ئەم دیمەنە ئەکا بە شپرزەیی و هەناسە سواریەوە، بەتەواوی سەرسامی گرتی لەم ئەنجامە سەیرە بێ وێنەیە، بەوەی منالە کلۆلە داماوەکەی ماوەیەکی دوورو درێژە زەردەخەنە نەپەڕیوەتە سەر لێوەکانی، هەموو زانیاریەکی ئەو سەردەمە لەگەڵ هەموو فرۆفێڵێکا نەیتوانی بوو دڵی گوشراوی ئەو دایکە بخاتە خۆشیەوە.

لە ڕاستیا جێنشین هەستی بەخۆشی کرد بە ئەنجامی ئیحەی راسپۆتین. ئیحە و نوستنی موگناتیسی ئێستا شتێکی زانراوە لای ئێمە، بەلام ئەو سەردەمە وا ئەدرایە پێنوس کە کەرامەتی پیاو چاکان و موعجیزەی ئاسمانی یە، یا سوێند خۆرییە لەتەك شەیتانا، بۆیە جێی سەرسوڕمان نیە کە شابانو باوەڕ بێنی بەوەی کەوا کوڕەکەی وەك لەناو گۆڕا زیندوو بێتەوە وایە، دیارە راسپۆتین بەڕاستی و دروستی پیاوێکی پیرۆزە... پیاوی هەلبژاردەی خوایە..

ئەوەی لێرەدا شایانی باسە ئەوەیە کە لەڕاستیا دەمار شلی قەڕالیچە دەوری خۆی گێڕا، نەك لەلایەن منالە نەخۆشەکەوە بەلکو لەلایەن دایکیەوە، بەو پێیەی کە هەر راسپۆتین دوورکەوتەوە منالەکە چووەوە دۆخی جارانی، وە نیشانەی شادمانی لە کوڕە دوورکەوتەوە، هەر وەك

چۆن بەختەوەری شابانوش ڕەوییەوە، سەر لەنوێ شڵەژاوی و شپرزەیی دای گرتەوە، چونکە ئەمیش وەك کوڕەکەی دەماری لە جێی خۆی نەمابوو.

بەم جۆرە کە راسپۆتین لە کۆشك دەرچوو، هەستی بەخۆی کرد کە بەئاسانی دەستی گرت بەسەر هەموو شتێکا و هێندە ناخاێنێ کە شابانو لە هەموو دەسەڵاتی خۆی دێتە خوارەوە بۆی، بەوەی بە کەمترین سەیرکردنێکی راسپۆتین دێتە لەرزین، ئا ئەوەتا شابانوی ڕوسیای بەڕێز بۆتە کۆیلە و کارەکەرێکی گەردن کەچ و زەبون بۆی!

لەگەڵ ئەم هەموو ملکەچی یەی شابانودا بۆ راسپۆتین مێژوو گەواهی ئەوە ئەدا کە دۆستی راسپۆتین نەبووە، وە نەی وێراوە ئەم هەنگاوە سامناکە هەڵبێنێ بەوەی ئافرەتێکی خۆرسکی بە ئاینی ڕاست بووە، زۆر دەربەست بووە بە داوێن پاکیەوە ئەگەرچی داماراوی و رارابوو.

**قەیسەری ڕووس**

ئەتوانین بڵێین کە راسپۆتین لە شەو و ڕۆژێکدا بوو بە پارچەیەك لە کەلوپەلەکانی ناو کۆشکی قەیسەری، ئەی توانی بە ئارەزووی دڵی خۆی بەناو کۆشکی زستانەدا بگەڕێ، لە هەر کاتێك دا بیەوێ بچێتە ئەو بەشە تەرخان کراوەی شابانو لە کۆشکی قەیسەری، وەك چۆن یەکێ لە ماڵی خۆیا بێ، دەسەلاتی بەسەر قەڕالیچەدا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ جێگیرتر ئەبوو، هەتا گەیشتە ئەو ڕادەیەی بۆ هەموو کارو شتێك ئەبوایە ڕاوێژی بەو بکا، بەتایبەتی لە ئیش و کاری دەوڵەتی دا.

ئەم ڕاوێژی کردنە بوو بە نەریتێ، قەڕالیچە لێی دەرنەئەچوو لە هەموو ئیش و کارێکا بچوك بوایە یا گەورە.

کەچی راسپۆتین بە کەمتر سەیری قەڕالیچەی ئەکرد، بۆیە خۆی بە نەریتی (ئەتەکێتەوە) نەئەبەستەوە، بە دەنگێکی بەرز ئەدوا لە فەرمان دەرکردنیا لەگەڵ شابانو هەر بەو زمانە ئەدوا کە لەگەڵ کارەکەرەکانی ناو کۆشك دا گفتوگۆی پێ ئەکرد، بەو نیازەی وا پیشان بدا کە لە هەموو ئادەمیزادێکی سەر ڕووی ئەم جیهانە پیرۆزترە، با سەردارو سەرۆك و دانیشتووی سەر تەختیش بن.

راسپۆتین وا لە هیچەوە بوو بە کەڵەگا بەسەر شابانوەوە، بەڵام هێشتا بەخزمەت خودی قەیسەر نەگەیشتبوو، بۆیە ئەیویست ئەویش هەڵسەنگێنێ وەیا وەك نێچیر ڕاوی بکا.

بێ گومان نیکۆلای دووهەم بە مەزەنە مەترسی لەم قەشە نەگریسە کردبوو، کە جڵەوی ژنەکەی کەوتبووە دەستی یەوە، وە بۆتە فەرمانڕەوای یەکەم لەناو هەموو کۆشك دا، لەگەڵ ئەوەش دا قەیسەر لەژێر باری دەسەلاتی ژنەکەیا دووچاری ئەوە بوو کە بە کڕنوشا بێ بۆ راسپۆتین، چونکە دواڕۆژی ڕەچەڵەکی قەیسەری، مان و نەمانیان لەسەر خواست و

ارادەی ئەم قەشەیە وەستاوە کە ئاسمان توانایەکی خروسکی لەسنور بەدەری پێ بەخشیوە.

قەیسەر نیکۆلای دووهەم –وەك ئەزانرێ– پیاوێکی دڵ ساف و خۆش باوەڕی بودەڵەی دەبەن

بوو، دڵی کەسی لەخۆی نەئەیەشان، زۆر دەسە پاچە بوو بەرامبەر ئەو دژوارو گیروگرفتانەی سەرەڕێی پێ ئەگرت، ئەویش بەوێنەی ژنەکەی لە ترسی کوشتن چووبووە قاوغەکەی خۆیەوە، دڵ کرمێی ئەم بووە هۆی حەیا پایامال بوونی پۆلیسە سیاسیەکان، کەوابوو دەمار شلی ئەمیش هەر لە دەمار لاوازی ژنەکەی ئەچوو، بۆیە ئەمیش وەك ژنەکەی لە ڕووی راسپۆتینا خۆی بۆ ڕانەگیرا.

بەڕاستی یەکەم بەیەکگەیشتنی راسپۆتین و قەیسەر شایانی تۆمار کردنە، بەنیازی یەکالا کردنەوەی ئەو شتە سەیرانەی ناخۆشە بیشارینەوە! ئەم چەوتەڵە هەر ورد ئەبووەوە لەو پیاوە هێمنەی خەڵکی بە جانەوەرێکی ستەمکاریان دابووە پێنووس، قەیسەر پیاوێك بوو کورتەبالا، ڕیشێکی تۆپزی داهێنراوی بەردا بووەوە، ناوچەوانی بەچالا چوو بوو چاوەکانی سارد و سڕ بوون، لوتێکی فش و دەمێکی خاوو خلیچکی پێوەبوو، هەر لە فەرمان بەرێکی خومار ئەچوو، کە دەربەست بە هەڵسوڕاننی کاروباری خۆی بێ، لەگەڵ ئەوەش دا ڕوکەشێکی بەرزی ڕەگەز گەورەیی تیا بوو.

شتێکی سروشتی یە راسپۆتین –کە پسپۆڕێکی خڕوسکی دڵ و دەروونی خەڵکی بوو ئەیتوانی ئەم ڕاستیانە لە قەیسەردا بدۆزێتەوە: کەوا قەیسەر ڕادەی زیرەکی مامناوەنجی یە، بۆیە هەر شاگەشکە بوو کە خۆی دی حووچێکە وەك منارە چووە بە ئاسمانا لەچاو ئەو پیاوە بستە بالایەدا، بۆیە تیشکی چاوەکانی ئاڕاستەی چاوەکانی قەیسەر کرد

ئەوەبوو قەیسەر هەر خۆی بۆ ڕانەگیرا لەبەریا.

نیکۆلای دووهەم تەلاشی ئەوەی کرد خۆی لەو شلەژانە ڕزگارکا، ئەوەبوو دەمی هەڵهێنایەوە، سوپاسی خۆی پێشکەش بە قەشە راسپۆتین کرد بەرامبەر بەو خزمەتەی نواندی بۆ جێنشینی کوڕی، کاتێکی بەخۆزانی کە بەزمانێك گفتوگۆیی لەگەڵ ئەکا وەك لەگەڵ هەرچی و پەرچییەکا بدوێت، نەك بەو زمانەکەی کە خەڵکی خوویان پێوەگرتووە، ئەو زمانە تایبەتیەی خەڵکی بەکاریان ئەهێنا بۆ گفتوگۆ لەگەڵ سێبەری خوا لەسەر ئەرزی ڕوسیای پیرۆز!

قەیسەر هەر لەجێی خۆیا حەپەسا و نیشانەی سەرسامی لە ڕوخساریا بەئاسانی ئەخوێنرایەوە، بەوەی ناوچەوانی چرچ و لۆچی تێکەوت و شانەکانی بۆ بەرزکردەوە، ئیش بەوە چاك بوو شابانو خۆی لەوێ بوو زرنگانە بەهانای قەیسەرەوە هات وە بەچاوێکی پڕ لە سەرزەنشتییەوە سەیرێکی قەیسەری کرد، ئەمە بوو بەهۆی ئەوەی کە گەرداوەکە بەهێمنی دامرکێتەوە.

لە ڕاستیا نیکۆلای دووهەم حەزی بە پەشێوی نەبوو بەتایبەتی پەشێوی خێزانی، چونکە ئەویش ئەیزانی کە ژنەکەی دەماراوییە و کەم چیکڵدانەیە، قەیسەر پیاوێکی هێدی و لەسەرخۆ بوو حەزی لە ئاسودەیی و هێمنی و ئاشتی بوو.

ئەم هەموو دەربەست بوونەی قەیسەر بۆ وچان و حەسانەوە، ئەنجامەکەی بەوە گەیشت کە سەرتاپا ژیانی زنجیرەیەك دژوار و گیرو گرفت بێ.

پێشینان چاك و ڕاستیان وتووە:

– ئەوەی ئاسایشی هەمیشەیی بوێ ئەبێ ئامادەبێ بۆ هاتنە کوڕی شەڕەوە، ئەوەی زۆر لە مەرگ و مردن سڵ بکاتەوە مەرگ و لەناوبردن

بەگورجی بەرۆکی ئەگرێ، هەر وەك ئەوانەی هەراسان بوو لە دەست کوێرەوەری ژیان و خۆیان بەدوای مەرگا ئەگەڕێن، کەچی مەرگ قەرەیان ناکەوێ، هەر کەس حەز لە ژیان بکا مەرگ بەردەرگای پێ ئەگرێ، ئەوەی بەتەنگ ئاسایشەوە بێ هەرگیز شەڕ بەرۆکی بەرنادا.

کە راسپۆتین قەیسەری بەجێهێشت بیری لەسەر ئەوە سەقام گیربوو، کە ئەبێ چۆن لەتەکیا بجولێتەوە، بە خروسکی خۆی هەستی بەوە کرد، کە نیکۆلای دووهەم بەتەواوی گەردن کەچی ژنەکەیەتی، ئامادەیە چی بوێ بۆی بکا، هەر بەو مەرجەی ژنەکەی ایێی گەڕێ بەئاسودەیی و دوور لە شەڕەشەقی ژیان بژی، لەوە بەولاوە دەستی لە هەموو شتێ شتبوو بەتەنگ هیچەوە نەدەهات.

راسپۆتین سەرنجی ئەوەی دا مە قەیسەریش دیسان دەماراوییە، ترسنۆك و بودەڵەیە، کە ئەمانە ڕێگای دابڕینی خۆی بەسەریا بە ایحای موگناتیسی ئاسانتر ئەکا، بۆیە کە راسپۆتین دوا ڕۆژی بۆ قەیسەر ئەخوێندەوە بە ئەستێرەگەری وای ئەبردە مێشکی شڵەقاوییەوە کە مەترسی گەورە و سامناك ڕووئەدا کە لە خەیاڵی کەسا نیە، ئەبێتە هۆی لەناوچوونی، لەگەڵ ئەوەشا پێی باوەڕ ئەکرد و کوێرانە بە دوای خۆیا ڕائەکێشا.

کەوابوو ئەتوانین بڵێین راسپۆتین زۆر خۆشحاڵ بوو بەو دیدەنییەی لە (نیقی)، ئەم وشەی (نیقی)یەش ئەو نازناوە تایبەتییەی کە بەخەڵات هەر ئەو بەسەر قەیسەرا دای بڕی، بەکاری ئەهێنا لەکاتی گفتوگۆکردنی لەگەڵ شابانودا.

بەلام کچەکانی شابانو لەو هەویرە نەرمتر بوون لەناو دەستیا، بەوەی بەمیرات ئەوانیش دەمارشلی و کەللەیی و مێشك شڵەقاوییان لە دایکیانەوە بۆ ماوەتەوە، گەردن کەچییان بۆ دایکیان ئەنواند لە

ئامۆژگاریەکانی دەرنەئەچوون کە هەموو پەیوەندی هەبوو بەڕێزگرتن لە راسپۆتین بەوەی راسپۆتین فریشتەی پارێزەری بنەماڵەی قەیسەرییە بۆیە وەك کۆتری دەسەموو لەبەردەستیا، هێندە هۆگرو رامی ئەوبوون هەر وەك کچی ڕاستەقینەی راسپۆتین بن هەرگیز لێی دڵگیر نەئەبوون.

هەروەها راسپۆتین هەرچی بەدەما بهاتایە ئەی گێڕایەوە لەبەردەم ئەو کچە شازادە هەرزەکارانەدا کە لەتافی جوانی دا بوون، زۆرجار قسەکانی زۆر کراوە و بێتام بوو لەگەڵ ئەوەشا پرۆتستۆیەك (احتجاج) بەرز نەدەبووەوە لە پیاوان و ژنانی دەست و پێوەندی کۆشکی قەیسەرەوە.

لە سەرەتادا، واتە لەسەرەتای کارا کە هێشتا راسپۆتین تازەبوو لە کۆشکا، ئەو لەلە ئەڵمانیەی پەست کرد، ژنە لە شەرم و تەریقی دا دەموچاوی سور هەڵگەڕا، کە گوێی لەو جۆرە قسە سوکانە ئەبوو، بۆیە چوو سکاڵای راستەوخۆی دەربڕی لەم جوڵانەوە ناشرینەی راسپۆتین، کەچی شابانو لەم ژنە ساویلکە بەڕێز و گرانە تورەبوو، بەوەشەوە نەوەستا لەسەر ئیشەکەی دەری کرد، وە دەرگای کۆشکی قەیسەری لەڕوویا داخست و هاتنە کۆشکی لێ قەدەغە کرد.

ئەم دەرسە بووە سەرمەشق بۆ ئەو کەسانەی دڵیان ختورەی ئەوەی کرد بچن و ڕەخنە لە کردەوەکانی راسپۆتین بگرن لە دوور و نزیکەوە. دیسان لەمێژوودا بەڵگەیەکی ئەوتۆ نیە کە پەیوەندی خراپ بداتە پاڵ ئەو کچانەی قەیسەرەوە بەوێنەی دایکیان کە لەو جۆرە پەیوەندیانە دوور بووە.

بەکورتی راسپۆتین هەر بە چەند هەفتەیەك بوو بە ئەمینداری هەموو ڕاز و نیاز و نهێنی بنەماڵەی قەیسەر، نەك هەر ئەوە بەڵکو دەسەڵاتی بەسەر هەموویانا ئەشکا، بەبێ چەند و چوون، هەتا بەسەر خودی قەیسەریشا، ئیتر بە ئارەزووی خۆی تەزبیحاتی پێ ئەکردن!

بووکە شوشەی بەجەڕو قوڕمیش

جێنشن منالێکی ساویلکەو سادە بوو لەناو دوولەپی پۆلایی راسپۆتینا وەك مێو بوو چۆنی بویستایە هەڵی ئەشێلا، تێکچوونی تەندروستی ئەم هەرزەکارە لەلایەك، وە رادەی بێ وێنەی ئەو پزیشکە درۆزنە سەیرە لەلایەکی ترەوە، ڕۆژ بە ڕۆژ نرخی بەرز ئەکردەوە، ئەم نەخۆشە بێ گوناهە بێ پەروا و بێ نیاز خزمەتی خواستی پیسی ئەم جادووگەرە نەگریسەی ئەکرد، بەوەی راسپۆتین بە ایحا کاری لێ ئەکرد و خۆش حاڵی ئەکرد، راسپۆتین لەلای جێنشین ئەو پەیکەرە بوو کە نیشانەی ژیان و زیندەگی و تەندروستی و پیرۆزییە، جگە لە هەڵخوێندنی دایکی بەگوێیا، ئا بەم هەموو پڕوپاگەندەیە باوەڕی جێنشین بە راسپۆتین وەك باوەڕی بە سەختی و گرانی ئەو کەژ و کێوە بەرزانە وابوو.

وا دەرئەکەوێ کە راسپۆتین ئەیزانی چۆن خۆی دابڕێ بەسەر ئەو بنەماڵە کلۆڵەدا کە حوکمڕانی ڕوسیایان بەدەستەوەیە، لێیان بووبوو بەبا، نەیان ئەتوانی هەناسەیەك بەبێ ئەو بژین، وە لە هەمان کاتا ئەیزانی چۆن ئەم بێدەسەڵاتیەیان بکا بە بیانوو بۆ جێبەجێ کردنی هەموو خواستە پیسەکانی خۆی بەبێ چەند و چوون ئەگەر شابانو ناو ناوە دوودڵییەکی بنوانایە، دەربارەی پێ لێ هەڵکێشانی یا بە ئاشکرابوونی خواستە لە ئەندازە بەدەرەکانی، خۆی گرژ ئەکرد و ئەیوت:

- زۆر باشە، خۆم ئەکێشمەوە ئەگەڕێمەوە بۆ کلێسەکەی خۆم لەوپەڕی سیبیریا.

بەمە شابانو بەناچاری ئەکەوت بەسەر کەوشەکانیا و لێی ئەپاڕایەوە کە کوزە کلۆڵەکەی بەجێنەهێڵێ کە بەهۆی ئەوەوە ئەژی، بەناچاری سەری بۆ شۆڕ ئەکرد بۆ بەجێهێنانی خواستەکانی.

یەکەم هەنگاوێکی راسپۆتین بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتی لەسەر لوتکەی

گردۆلکـــەی دەوڵـــەتا بـــژارکردنی دام و دەزگـــای حـــوکمڕانی بـــوو لـــە ناحـەزەکانی خـۆی، لـە گـەورە فـەرمان بـەرەکان و سـەردارو باڵویزەکـان و ئەوانـەی کـە هێشـتا سـەریان بـۆ شـۆڕ نـەکردووە، دەسـت بـەجێ دەری ئـەکردن لـە ئیشـەکانیان، وە جێگاکانیـانی بـەو پیاوانـە پـڕ ئـەکردەوە کـە لەدەســت و پەیوەنــدە پیرۆزەکــەی بــوون کــە بــۆ جێبــەجێ کردنــی خواستەکانی راسپۆتین سەریان پێوە نەبووە.

زۆری نـەخایان هـەموو مرۆڤێك لـە پترس بورگـا ئـەوە تێگەیشـت ئەگـەر بیـەوێت مووچـە بـڕاو نـەبێ و لەسـەر ئیشـەکەی دەسـتی نەکێشـەوە ئـەبێ دەسـتی قەیسـەری ڕاسـتەقینەی ڕوسـیا واتـە (راسـپۆتین) مـاچ بکـا، لالـە کریکۆری یەکەم!

قسـەو هاشوهوشـەی درۆ و سـەرزارەکی مـەرایی کـەران بـەگوێی ئـەو ئاشنا نەئەبوو ئەبوایە مەرایی کردنەکەیان بزرنگێتەوە بە زرەی زێڕو زیو، هەرگیز چاوی لەپارەی حەرام تێری نە ئەخوارد.

بەم جۆرە وردە وردە جێگەی قەیسەری گرتەوە لە هـەموو شتێکا، هـەتا لە هەڵبـژاردنی وەزیرەکانا، دانـانی وەزیرەکـان بـەبێ پرسـی ئـەو نـەدەبوو، هەر وەکو لەڕێگـەی دەسـەڵاتی دابڕاوی ئـەما بەسـەر شابانودا بەڕاسـتی و دروستی لەسەر تەختی ڕوسیای پیرۆز دانیشتبێت بەبێ چەند و چوون، هەر وەك چۆن (لی بی ساد)ی خەساو دەستی گرت بەسـەر ئیمپراتۆریـەتی کۆنی چینا، لەڕێگـەی چەسـپاندنی دەسـەڵاتیا بەسـەر دایکـی ئیمپراتـۆر (تسوهی)دا لەگەڵ جیاوازیەکی گەورە کە خەسـاوی چینی جیـا ئەکاتـەوە لەم جوتیارە سیبیریەیە ئەویش ئەوەیە ئەم هـەتا تەوقەسـەری لـە زەلکاوی داوێن پیسیـیا نوقم بووە!

راسـپۆتین پەلـە قـاژەی وەرگرتنـی نازنـاوێکی ڕەسـمی ئـەکرد بـۆ خـۆی کەچـی تـەنیا فـەرمانێکی سـووکی بـۆ خـۆی هەڵبـژارد ئـەویش فـەرمانی

(داگیرساندنی چراکان)ی کۆشکی قەیسەری بوو، ئەوەشی هەر بۆ ئەوە بوو بەبێ پرس و ترس بتوانێ سەر بە هەموو کون و قوژبن و ژوورێکی کۆشکا بکا و تیا بسوڕێتەوە بەشەو بێ یا بە ڕۆژ، بە بیانوی ئەوەی بزانێ پێش خزمەتانی کۆشک چرایان لەژێر هەموو مۆمدانە پیرۆزەکانی ناو کۆشکا داگیرساندووە!

*********************

راسپۆتین لە پترس بورگ زۆر ئاسودە بوو، بەڵام ئەم داوێن پیسە نەگریسە گەلێك چاوبرسی و چڵێس بوو، بە دەردی خۆیەوە دا نەئەنیشت، هەتا ڕۆژێکیان بە شابانوی وت:

-نیام هەیە گەشتێکی نزرگای ئەو پیاوچاکانە بکەم کە پیاوانی ئاینی بوون، ئێستا خەڵکی بۆ تەواف ڕوویان تێئەکەن، وە ئەم گەشتەشم زۆر ئەخاێنێت.

پاڕانەوە و لالانەوەی قەڕاڵیچە هیچ دادێکی نەدا، راسپۆتین لە قسەی خۆی پاشگەز نەبووەوە، چونکە نیازی وابوو بەو دوور کەوتنەوەیەی تالاو بکا بەگەروویانا، هەتا باشتر هەڵ سەنگێنن، چونکە ئەیزانی تەندروستی جێنشین بە دوورکەوتنەوەی دەست بەجێ بەرەو خراپی ئەڕوات، ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی تریشەوە خوێنەرانی ئەم چیرۆکە لەبیریانە کە راسپۆتین بەر لە هاتنی بۆ پترس بورگ، سەردەمێك لە مۆسکۆ بوو، بەڵام ئەوەبوو چنگی لە ژنانی بەرزی ئەوێ گیرنەدەبوو، بەوەی کەلوپەلی فروفێڵی تەڵەکەبازی تەواو نەبوو، ئەوەبوو هێشتا لە میری و کڵێسەوە باوەڕ پێکراو نەبوو، پشتگیری لێ نەدەکرا، بەڵام ئێستا ئەو دوو دەلاقە گەورەیەی پڕ کردۆتەوە و هەردوو لایانی دەم کووت کردووە، وا ئێستا بەبێ ترس و لەرز ڕووی کردۆتە (کرملین) بۆ داگیرکردنی مۆسکۆ بەوێنەی داگیرکەرێکی خاوەن هێز و توانا، بۆ گەیشتن بەو ڕابواردنەی کە لە

سەرەتای کارەوە بێزووی پێئەکرد و بەڵام دەمی نەئەگەیشتێ!

بۆ ئەمەش یەکسەر نەچووە مۆسکۆ، بەڵکو دەستی کرد بە سوڕانەوە بە هەموو هەرێم و ناوچەکانی وڵاتانا بۆ چاوبەستی لە خەڵك، پاشان پێچی دایەوە بۆ بەرەو پایتەختی دێرینی بەرەی سۆڵافی‌یەکان، دەنگی دەهۆڵی پڕوپاگەندە و ناوبانگی بەر لەخۆی دەرودەشتی پڕکردبوو، بە پەرۆش بوو بۆ دیدەنی لە برادەری گیانی بەگیانی (بەرنابا) کە راسپۆتین لە دەروێشێکی خومارەوە گەیاندبوویە پایەی سەرۆکی قەشەکان، وا ئێستا نازناوی (مەرەکەبی پیرۆز) هەڵئەگرێ، بەرزکردنەوەی بەرنابا بۆ ئەم پایەیە شتێکی ئاسان نەبوو، چونکە کڵێسەی ارسۆدۆکی خاوەنی یاسا و نەریتێکی دێرینە بەئاسانی لەخشتە نابرێ، بەڵام راسپۆتینی سەرسەخت هیچ کەند و کۆسپێك نەیئەتوانی سەرە ڕێگای پێبگرێ، هەر ئەوەندەی ئەمینداری کڵێسەی پیرۆز ویستی سەرکێشی بکا لە پاڵاوتنی (بەرنابا)دا بە گوورزێکی گران ئەو قەشەیەی لە ئەمینداری ئەو کۆمەڵە خست، بەگورجی مەتڕانێکی تری، خستە جێگاکەی کە لە گەردن کەچانی خۆی بوو، لەوانەی کارامەو دووربین بوو بۆ سودی خۆیان بۆ کەڵك وەرگرتن لە دەرفەت.

هەروەك چۆن ئەمینداری ناوبراو لە پەلوپۆ خرا، هەر بەو چەشنەش نوورزەی لەسەرۆکی باڵبازی نهێنی بڕی، هەر لەبەرئەوەی دڵسۆز و گورج و گۆڵ بوو لەکاروباریا، بەوەی دڵی (چرا داگیرسێنەری) پیرۆزی لێ ڕەنجا بوو، بەم پێیە ئەم دوو جوتیارە کۆنەبرادەرە جارێکی تر ئێوارەیەك لە ئێوارەکانی مۆسکۆ یەکدگیر بوونەوە، وا ئێستا دەستی ڕۆژگار هەردووکیانی گۆڕیوە لە نزمی‌یەوە بۆ لوتکە، دەستیان کردە گەردنی یەك، وەك جووتە برایەکی خۆشەویست، تێروپڕ یەکتریان ماچ کردو لێستەوە لەسەر نەریتی ڕوسی کۆن.

بۆ ئەوەی ئەسقەفی گەورەو گران، بەڵگەی گەردن کەچی و وەفاداری و باوەڕی خۆی بۆ راسپۆتین بنوێنێ، دیاریەکی نایابی پێشکەش کرد بە خودانی ئەم ناز و نیعمەتەی کە هەتا تەوقەسەری تیا نقوم بووە، ئەو دیارییەشی خوشکەکەی خۆی بوو کە لە سیبیریاوە هاتبوو بۆ مۆسکۆ، هەتا لەنزیك کاکی‌یەوە ژیان بەسەربەری، کەوا دەستی شاراوەی ڕۆژگار ئێستا لەسەر تەختی ئەسقەفی داینـاوە.

راسپۆتین بەم نێچیرە گەلێ دڵشاد بوو هەر وەك چۆن قایل بوو بەوەی بیکا بە یەکێ لە ژنە گیانیەکانی خۆی، راسپۆتین هەر بەوەوە نەوەستا کە بەیەکێ لە ژنە گیانیەکانی خۆی دایە پێنوس بەڵکو کردی بە سەرۆکی (دێری راهات) کە نیازی دروست کردنی هەبوو لە گوندەکەیانا واتە لە دێی (بۆکرۆنسکی).

زۆری نەخایان کە لە خوشکی بەرناباش تێری خوارد، بۆیە داوای لە مەرەکەبی پیرۆزی کرد بەنا خەڵکا بڵاوی بکاتەوە کە قەشەی خاوەن موعجیزە و بەناوبانگ، ئامادەیە چاوی بە ژنانی نەخۆش کەوێ و چاکیان بکاتەوە، ئەم هەواڵە وەك ئاگر لە پاوان بەربێت بەگورجی هەموو کون و قوژبنێکی مۆسکۆی گرتەوە.

ئیتر بارەگای راسپۆتین بووە قبلەکانی ژنانی هەڵبژاردەی شۆخ و شەنگی چینی دەوڵەمەند و بەرزی شاری مۆسکۆ، قامچی چاولێکردن و بەخالەتی ئافرەتانە و ئارەزووی فریو خواردنیان بە ئەفسانە و جادوگەری پاڵی پێوە نابوون.

راسپۆتین پێشوازی لەو ژنانە ئەکرد و ڕادەی ساویلکەیی و باوەڕی کوێرانەیانی تاقی ئەکردەوە، ئنجا ئەکەوتە هەڵبژاردنی ناسك و شۆخ و شەنگەکانیان کە لەبارەی گەنجیانەوە بێ وێنە بوون، وەك هەویر لەناو دوو دەستی بە هێز و تینیا یاری پێئەکردن، وە بە ئاسانی ئەیهێنانە

کۆڕی ئاینی تازەیەوە کە لەسەر بناغەی نقوم بوون لە داوێن پیسیا پاشان دەربڕینی پەشیمانی بۆ دەست گیربوونی بەرەکەتی زۆر دامەزرابوو.

بێگومان هێندێکیان دەماراوی و هێندێکی تریان سۆزانی بوون، ئەم نەریتی داوێن پیسیەی ئالاَند بوو بە جاویدانی و پەرستنی ساختەوە ئەمەش ڕێگەیەك بوو کە مێشك شڵەقاوەکانی ئەخرۆشاند.

ئەگەر راسپۆتین ئەم نەریتە تازەیەی خۆی لەناو نەتەوەیەکی وەم ژاپۆنا بڵاوکردایەوە سەرنەئەکەوت، چونکە ئیش و کاری پەڕین (جنس) لەلایان بەگران نەگیراوە، نرخی ئەم جۆرە ئیشانە وەك لوت سڕینێ یا دەست بەئاو گەیاندن یا وەك ئاو خواردنەوە وایە، بەلاَم بۆیە لە ڕوسیادا سەرکەوتنەکەی دەنگی دایەوە لەوێ ئیش و کاری پەڕینی بە توند گیرابوو، بە تاوانێکی گەورە ئەژمێرا، بۆیە هەر شتێك پەیوەندی بەم لایەنەوە هەبوایە مێشکی خەڵکی شپرزە ئەکرد، وە پێکهێنان و سەرپێ گرتنی ئەم کارە لەگەڵ پیاوێکی وا ناسراوی پیرۆزا سحرێکی تایبەتی هەبوو، چونکە ئیشێك بوو ئەنجامێکی ترسێنەری هەبوو، لە هەمان کاتا شتێکی تازە بابەت بوو، لەبەرئەوە ماڵی راسپۆتین لە مۆسکۆ قبلەگا و شوێن تەوافی ئەو ژنە داوەشاوانە بوو کە خۆیان ئالاَند بوو لەو بیانوەی کە بە داوێن پیسی، پاشان بە پەشیمانی خۆیان پاك بکەنەوە بەو نەزرانەی گرتبوویانە ئەستۆی خۆیان، ئا بەم جۆرە پەردەی شەرم و شورەیی لە ناوا پایەماڵ بوو بوو!

شتێکی ئاشکرایە کە مێرد و باوك و براو کوڕو کەسوکاری ئەو ئافرەتانەی ژن و کچ و خوشك و دایکیان بەدەست ئەو جانەوەرەوە ناموسی شکێنرابوو هەموو بەجارێك لێی بەڕقا کەوتبوون و ئاگری تۆڵە لە دڵ و دەروون و مێشکیانا جۆشی ئەخواردەوە.

هەندێ لەو پیاوە بەڕقا چووانە خاوەن پایەو فەرمانی بەرزبوون لە

دەوڵــەت و کۆمــەڵگادا، دوو دڵیــان نەنوانــد لــە هۆشــیارکردنەوەی کەلاّنتــەری باڵبــازی (مــدیر الشــرگە) لــە کــردەوە ناهــەموارەکانی ئــەم نەگریسە، پاڵیان بە کەڵەنتەری باڵبازییەوە نا کە چارەسەریّ کیان بکا.

شەوێك لە شەوان راسپۆتین لە ماڵەوە بوو، هەندێك لە ژنە (گیانی)یە تازەکـانی دەوریـان لـیّ دابـوو، ژمارەیـان دە ئـافرەت ئـەبوون، راسـپۆتین پرزۆڵـی لەبـەردا نەهێشـتبوون، لـە ژێـر وێنەیـەکی گـەورەی مەریـەم دا رای وەسـتانبوون، خۆشـی لـە ناوەڕاسـتیانا نوێـژی تۆبـەی کردنـی بـۆ لێخـۆش بـوون لـە یەکەم گونـاهی دایـە حـەوای بـۆ ئەکردن کە چۆن سـەبارەت بـەو گوناهـە کـە حـەوا بـاوە ئـادەمی لەگـەڵ خۆیـا هـەڵفریوان بـۆ تێـوەگلان بـە خـواردنی لـەو سـێوەی خـوا قەدەغـەی کردبـوو لێیـان، بـەو تاوانـەیان لـە فـەرمانی خــوا سەرکێشـیان کـرد، ئـەوەش بـوو بـەهۆی مـاڵوێرانی و کوێرەوەری بۆ هەموو نەوەکانیان واتە هەموو ئادەمیزاد.

شتێکی سروشتی یە کە راسپۆتین بە دەوری ئادەم هەڵئەسا، کە ئەم دەورەی لیّ ئەوەشایەوە، بە قەلاّفەتی تێك سمڕاوی چوارشانەی درێـژیا، بەشـێنەیی بـەربوو بـووە پـرچ ڕاکێشـان و لێـدانیان بـە ڕووتـی و قـووتی، سـزای ئـەو تاوانـەی کـە دایـە گـەورەیان کردوویـە... ئـەوانیش هـۆن هـۆن فرمێسکی قـەوی قـەوییان هەڵئەڕشت نیشـانەی پەشـیمانیان لـەو گوناهـە ناهەموارانـەی جـار لـەدوای جـار پـاتی ئەکەنـەوە، بـە نیـازی سـڕینەوەی پیسیان و بۆ خاوێن کردنەوەی دڵ و دەروونیان!

ئـا لـەم کاتـەدا بـوو کـە بەتونـدی لـە دەرگایـان دا، پاشـان بـە خـورتی کردیانەوە، کەلاّنتەری باڵبازی بە خۆی و جلوبەرگی رازاوەی رەسمییـەوە لە بەردەمیا قوت بووەوە، ژمارەیەك باڵبازیش بە دوایەوە بـوون، راسپۆتین لەچاو قایمی ئەم فەرمان بەرە هەر وشك بوو!

بۆیە چاوی لیّ مۆرکردەوە بە جۆرێکی وا کە گاڵتەی پیّ بکا، واتـە سـوك

سەیری بکا، لە کەلانتەری پرسی:

- ئەزانی من کێم؟

کەلانتەر بە چاوقایمی خۆیەوە شانێکی بۆ هەڵتەکان و وەلامی دایەوە:

-دەربەست بەوە نیم تۆ کێیت و کێ بیت!

پاشان ئاوڕێکی لەو فریشتە و پەرییە ڕووتانە دایەوە کە ئەشتەبای خوایان لەبەرا نەبوو هیچ شتێك دایانی نە ئەپۆشین قژە درێژە پەخش بووەکانیان نەبێ.

سەرنجی راسپۆتین و ئافرەتەکانی راکێشا بەوەی ژمارەیەکی زۆر باڵبازی لەژێر دەستایە، لەبەرئەوە ئامۆژگاری کردن کە لەقسەی دەرنەچن و سەرکێشی نەکەن.

پاش خۆ پۆشتەکردنەوەیان، هەموویان بران بۆ پاسگایەك، لەوێ ناونیشانیان وەرگرتن، پاشان خرانە ژووری گیراوەکانەوە هەتا فەرمانیان لەخۆیان بەرزترەوە بۆ دێ!

راسپۆتین دووچاری ئەوە بوو کە لە ژنە گیانێیەکانی دانەبڕێ و بەخورتی هەر لەگەڵ ئەوانا ببرێنە نوختەیەکی باڵبازی، راسپۆتین تێك نەچوو، زەردەخەنەیەکی گاڵتە پێکردن پەرییە سەر لچەکانی، ئەمەش نیشانەیەکی تری نەترسانی ئەم جانەوەرەیە ڕووی کردە ژنە گیراوەکان کە لەبەر ترس و تۆقین هۆشیان لای خۆیان نەمابوو، پێی وتن:

- لە هیچ شتێك مەترسن.... لەو پیاوانە نیم پشت لە ژنە گیانیەکانم بکەم بەهیچ جۆرێ.

پاشان ڕووی کردو کەلانتەری پۆلیس بە خەشمێکەوە وتی:

- لەخۆبایی بوونت نەگاتە ئەو رادەیەی ڕێگەی لێدانی بروسکەم لێبگری بۆ خاوەن شکۆ قەراڵیچە شابانوی بەرێز؟!

نوسراوێکی دەست نووسی شابانوی دەرهێنا، کە تیایا فەرمانی ئەدا

هـەموو پیـاوانی دەوڵـەت پێویسـتە لەسـەریان هـەموو جـۆرە یارمەتیـەك پێشـکەش بکـەن بـە هـەڵگری ئـەو نوسـراوە کـە نـاوی (قەشـە کریکـۆرە نازناوی راسپۆتینە) ئا ئەم نوسراوەی خستەبەر لوتی کەلانتەری باڵبـازی سەرسـەخت، ئـەویش لەترسـا سـڵەمیەوە و ئیتر نـەیوێرا ڕێگـای نـاردنی بروسکەی لێبگرێ.

که راسپۆتین دڵنیا بوو لـە نـاردنی بروسـکەکەی ڕووی کردە کەلانتەر و بە گاڵتەپێکردنێکی پلاراوییەوە وتی:

– لـە زوویەکـەوە ئـەمزانی کـە باڵبـازی مۆسـکۆ زۆر بێشـەرمن، بـەڵام نەمئەزانی کە پیاوانی بەم ڕادەیە گەوج و گێل و کەم بینن!

کەلانتەری باڵبازی تووڕەبوو، هەڕەشەی لە راسپۆتین کرد، کە لـە پلارو توانج گرتنـە پیـاوانی پۆلیس دەست هـەڵگرێ، کەچـی راسـپۆتین دای لـە قاقای پێکەنین و وتی:

–بـا قوڕەکـە نەبێتـە لیتـە و خـۆت تاوانبـارتر مەکـە بـا لـە کەلەبـەرێکی تریش نەکەویتە قەوارەی گەوجیت، وا دیـارە تـۆ لـەگوێی گـادا نوسـتووی ئاگات لەهیچ نییە، تۆزێ ئارامت بێ هەتا وەڵامی قەیسەر ئەگەڕێتەوە.

هێنـدەی نەخایانـد وەڵامـی قەیسـەریان بەدەسـت گەیشـت، کـە سـووك و بارێك و بەکورتی ئەمە بوو:

فەرمانێکی قەیسەری تیا بوو بە بەردانی بەندکراوی پیرۆز لەگەڵ گیراوە بـەڕێزەکانی تـردا دەسـت بـەجێ، لەگـەڵ دڕانـدنی دۆسـیەی لێکۆڵینـەوە (تحقـق)، مـە جگـە لـەوەی ئـەبێ داوای لێبـوردن و پەشـیمانی دەربـڕن بەرامبەر بە راسپۆتین، لەگەڵ فەرمانێکی تریشا بۆ فەرمانبەرانی کاروباری چـاپەمەنی بـەوەی ڕێگـە نـەدرێ لەڕۆژنامـەکانا شـتێك بنوسـرێ و بڵاوبکرێتەوە کە پەیوەندی بە چۆنێتی گێڕان و هەڵسوڕاندنی سیاسـەتی بەرزی وڵاتـەوە هەیە، لەتـەك ئەم هـەموو فەرمانانـەدا، فـەرمانێکی سـەیرتر

هـەبوو ئـەویش لابردنـی کەلانتـەر بـوو لەسـەر ئـیش و کـاری خـۆی بـەوەی هەڵەشـەیی کردووە و نـەفام و سـەر دەرنەچوو بووە لـە بەڕێوبەرایـەتیا بۆ ئیش وکاری حوکمڕانی لە دەوڵەتی خاوەنشکۆ قەیسەردا.

کـە راسپۆتین بروسـکەکەی قەیسـەری خوێنـدەوە کـە لەڕاسـتیا وەڵامـی بروسـکە نێراوەکـەی خـۆی بـوو، دایـە دەسـت کەلانتـەر و وەك دڕنـدە پیـا هەڵشاخا:

– با ئەمە دەرس بێ بۆت هـەتا جارێکی تـر وەك منـاڵ ئـەم کردەوەیـە دووبـارە نەکەیتـەوە لەگـەڵ کەسـێکا کـە پایـە و شـوێنی لـەخۆت بـەرزتر و بەهێزترە.

کەلانتەری لابراو وتی:

– مـن هـیچ شتێکم نـەکردووە لـەوە بترازێ کـە بـە پێویسـتی سـەرشـانم هەڵسام بە ڕاست و دروستی. راسپۆتین دایە قاقای پێکەنین و وتی:

– گونـاهی ڕاسـتیت ئەوەیـە کـە نەتئـەزانی بـە پێویسـتی سـەرشـانت هەڵسی و سـەرت لێدەرنـەکرد، چونکە ئەگـەر سـەرت لـە کاروبـاری خـۆت دەربچوایە وەك خەڵکی گەردن کەچیت بۆ من ئەنواند!

پاشـــان وەرچـــەرخایەوە ســـەرێکی ژنـــە گیانێیـــەکانی کـــرد، بـــە زەردەخەنەیەکەوە تێی گەیاندن کە بفەرموون لەگەڵیا بگەڕێنەوە ماڵەوە بۆ تەواوکردنی کاروباری (جاویدانی) خۆیـان کە بەنیوە و نیوەچڵ بەجێیان هێشتووە!

بەوپـەڕی گـەردن کەچییەوە دوای کـەوتن، بـەم جـۆرە لـە هـەمان شـەوا دەستیان کردەوە بەو بەزمـەی کە لـە سەرەتاوە پچڕابوو، ئیتر بەتـەواوی ماوە بەرەڵابوو بۆ ڕابواردن و پێکەنین و تەرەقینـەوە بەهۆی ڕوودانـی ئەو قەوماوە سەیرەوە، ئەوەی ئەهاتە سەر زمانیان نەیان ئەگێڕایەوە لە قسەی بـە پلارو تـوێکڵ و هـەتا بـێ تـوێکڵیش، کـە هـەموو ئـەو قسـە سـوکانەیان

ئاراستەی ئۆبالّی کەلانتەری پۆلیسی بەسەرزمانی داماویان ئەکرد، کە گێلانە ویستی یاسا جێبەجێ بکا کەچی کلۆلّە خۆی بەر سزای توند و تیژی یاسای ڕژێمی بۆگەنی قەیسەری کەوت!

دیارە خوای گەورە ئیشی بە دروست کراوەکانی خۆی هەیە!

گەڕانەوە

راسپۆتین بۆ پشودان و حەسانەوە و وچان گرتن، ئەوەبوو لە مۆسکۆ تەراتێنی ئەکرد بەڕاست و چەپا، بەو ڕێگە بیّ وێنەیەی کە بۆ خۆی هەلّبژاردبوو، ئا هەر لەم کاتەدا کە ئەو بە ئارەزووی دلّی خۆی ڕائەبوێریّ، پەشێویەکی گەورە کەوتبووە ناو دەستە و دایەرەکەی قەیسەرەوە لە کۆشکی زستانەدا لە پترس بورگ، ئەوەتا لە لایەکەوە جێنشین تەندروستی بەرەو خراپی ئەڕوا کە ئەمە بە تەنیا نیشانەی گەورەترین مەترسی ئەخاتەوە، هەر ئەم مەترسی‌یە شابانوی خستبووە هەلەکە سەما، بەوەی چارە ڕەشی خۆی لەوەدا ئەبینی کە ئەم کارەساتە گرنگە بەهۆی دوورکەوتنەوەی (پیاوی هەلّبژاردەی خوا) راسپۆتینەوەیە!

قەرالّیچە پەیتا پەیتا پەیام و نوسراوی پڕ لە پاڕانەوەو لالانەوەی ئەنارد بۆ راسپۆتین، داوای لێئەکرد بەزەیی بێتەوە بەخۆی و کوڕەکەیا کە ژیانی لەسەر لێواری گۆڕ ئەلەرزیّ، لەڕاستیا شابانو خۆی لە کوڕ'کەی پتر پێویستی بە بوونی راسپۆتین هەبوو بەوەی لە نزیکیەوەبیّ، چونکە نزیک بوونەوەی راسپۆتین هۆی ئاسودەگی بوو بۆی بەو هەستەوە کە ئەو هەموو توانا و هێزە گەورە پڕ لە زیندەگی‌یەی راسپۆتین پشتگیری لێبکا ترس و تۆقینی ئەڕەوێنێتەوە، بۆیە هەمیشە خۆی ئەبینی بە تەنیا بە تەنیشت جێگای ئەم کوڕە نەخۆشەوەیە، لەشکری پەژارە بەجاریّ هەست و هۆشی داگیر ئەکرد، لەبەرئەوە بۆ هەناسەیەك نەی ئەتوانی راسپۆتین لەبیربکا نە بە شەو نە بە ڕۆژ، ئەوەندە کەوتبووە ئەندێشە و لێکدانەوە

بەرامبەری هەتا لە نوستن و خەویشا هەر لەبەرچاوی بزر نەئەبوو.

شتێکی سروشتی یە دڵکرمێیی و پەژارەو لێکدانەوە و دوودڵی و بێ باوەڕی بەخەڵك، وای لە شابانو کردبوو کە ئەبوایە شەو و ڕۆژ باڵبازی نهێنی ئێشکی لێبگرن، هەتا گورج و گۆڵی بێ وێنەی ئەو باڵبازانە کەمێك ئاسودەیی بە دڵ نە ئەگەیان، ئەم ژنە ئەڵمانیی یە بە هیچ جۆرێك دڵی ئاوی نەئەخواردەوە و ئاسوودە نەئەبوو لە وڵاتی ڕوسیا کە هەستی دڵ و دەروونیان بەباشی تێناگا، وا ئەهات بەمێشکیا کە هەمیشە لەوانەیە خەنجەرێکی ژەهراوی شارابێتەوە بۆی لەناو چەپکە گوڵێکا کە پێشکەشی ئەکرێ، وە یا ژەهری کوشندە کرابێتە ئەو پێکی شەمپانیایەوە کە ئەبێ بەناچاری بیخواتەوە یا لەپڕ گوللەیەکی وێڵ لەو پەنجەرە کراوەیەوە خۆی ئەکا بەژوورا و ئەنیشێتەوە بەسەری دڵییەوە.

شابانوی کڵۆڵ لە هەموو تاقمێکی گەلەکەی ئەترسا، گومانی هەبوو بەرامبەر لەلە و کارەکەر و پێش خزمەتەکانی ناو کۆشك، تاوانی ناپاکی ئەلکان بە دڵسۆزترین پیاوەکانیا، وە بۆ پاکترین فەرمانبەرێکی دەوڵەتی بەرتیل خواردن و ناوونەتورەی پیسی ئەخستە دوایان.

لە ڕاسپۆتین بترازێ کەسێکی تری گومان نەئەبرد لە هەموو سەرانسەری ڕوسیادا کە باوەڕی تەواوی خۆی بداتی، ئەویش بەوەی باوەڕی بەهێز و توانای لەڕادەبەدەری هەبوو کە ئەبێ پەیوەندی بە فریشتەوەبێ، وا چووبووە مێشك و دڵییەوە کە هەر ڕاسپۆتین بەتەنیا ئەتوانێ بیپارێزێ لە کەین وبەینی دوژمنە شاراوە و ئاشکراکانی هەروەها ئەتوانێ لە هەموو بەڵایەك ڕزگای بکا.

لەبەر ئەمانە بوو خانەوادەی قەیسەری زۆر بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی گەڕانەوەیان ئەکرد، هەروەها گەورەی کەنیزەکەکان (ئانا) ئارامی لەبەر هەڵگیرا بوو، ئەوەی لەیاد نەکردبوو کە (ژنی گیانی) پیاوی هەڵبژاردەی

خوایە، بۆیە زۆر دڵگران بوو، وە هەستی بە ئازاری دابڕان ئەکرد لە راسپۆتین، ئەگەر چی ئەمەی لای کەس نەدرکاند بوو.

پەیتا پەیتا پەیام و نامە و نوسراوی ئەنارد بۆ ئەو (مێردە گیانیەی) بەگەرمی داوای گەڕانەوەی لیٚ ئەکرد، بە هەموو جۆریٚ لەبەریا ئەلالایەوە بەو نیازەی نەرمی بکا بۆ گەڕانەوە.

بەڵام راسپۆتین کەم و زۆر دەربەست بە پەیام و نامەی (ژنە گیانیەکەی) و شابانو نەدەهات، هەتا وەڵامیشی نەئەدانەوە، لەگەڵ ئەوەشا ڕۆژێکی هەڵبژارد کە لەناکاو خۆی بکاتەوە بە ماڵا لەسەر شێوەی گێڕانی دەوری خۆی لە دەووره شانۆییەیە سەیرە کتوپڕەکانیا!

هەر بە گەیشتنی بە پترس بورگ بەگورجی ڕووی کردە کۆشکی زستانە، بەبیٚ ئاگاداری و پێشەکییەك، یەکسەر خۆی کوتا بۆ شوێن جێگای جێنشین، خۆی گەیانە لای چرپاکەی کە لە سەری لاڵ و پاڵ درێژ بوو بوو. شابانوش بەدیاریەوە دەستە ئەژنۆ دانیشت بوو، هەر کە راسپۆتینی بەدی کرد خۆی پیٚ ڕانەگیرا، دەنگ و هاواری پیٚ خۆش حاڵی دەربڕی، وە لەبەری ڕاست بووەوە، پاشان بەچۆکا هات بۆ سەر پێڵاوەکانی (پیاوی هەڵبژاردەی خوا) وە سەری نینۆکەکانی دەستی ماچ کرد، لەناو جۆش و کوڵی دەروونی ئاگای لەوە نەمابوو کە ژێر نینۆکەکانی ئاخنراوە بە چڵك و پیسی بەجۆرێك هەتا بەراز قێزی لیٚ ئەکاتەوە نەك شابانویەکی ڕاستەقینەی گەورە و گران!

وە لەبەر کوڵی خۆشی و شلەژانی ئاگای لەوەش نەمابوو کە بۆنی ڤۆدکای لیٚ بڵند ئەبێتەوە!

بەڵام راسپۆتین هەڵوێستێکی وای نواند لەوە بچیٚ کە لە ئاسمانەوە وەحی بەسەرا هاتبێتە خواریٚ، وای لە چاوە زەقە سەیرەکانی کرد کە تیشکی ڕوناکییەکەی بەهێزتر لیٚ دەرچیٚ، بێگومان خواردنەوەی ڤۆدکا

هێزی ئەو تیشکەی پتر کردبوو، بە دەنگێکی قەبەوە بە شابانوی وت:
- وا گەرامەوەی ئەو (ئەلکسندرا) چونکە خوا خستی یە دڵمەوە بە وەحی کە کوڕەکەت لەمەترسی یەکی زۆردایە.
پاشان سەری خۆی بە پشتا خست، دەستی ڕاست و چەپی بەسەر سنگە پانەکەیا لەیەك هەڵکێشا، لەبەر خۆیەوە دەستی کرد بە بۆڵە بۆڵ، بە وشە و ورتەی نەبیستراو بەوێنەی بۆڵە بۆڵی مەجوسەکان لە جاویدانیانا، پاشان بەسەر نەخۆشە بچکۆلەکەدا نوشتایەوە، چاوی بڕیە ناو گلێنەی چاوی، هێندەی نەخایاند (موعجیزە) ڕووی دایەوە، ئەوەتا گەرمی خوێن تەوژم هەێنێ بۆ ڕووە زەرد هەڵگەڕاوەکەی، ئەوەتا چاوەکانیشی بریقەی ژیانی تێ گەڕایەوە، ئەوەبوو قەیرێ لەمەوبەر جێگەی دەست لێ شوشتن بوو!
خۆشی خۆشی پێکەوتنی شابانو ئەوە هەر مەپرسە، کە هەتا چ ڕادەیەك گەشاوەتەوە، بەوەی بە دووچاوی خۆی ئەبینێ ژیان و زیندەگی ئەگەڕێتەوە لەشی کەنەفتی کوڕە نەخۆشەکەی، کە پێش ئێستا بە کەمێك بە تەواوی تەندروستی هەرەسی هێنابوو بەرەو لەناوچوون.
بۆیە جارێکی تر شابانو بەچۆکا هات لەبەردەم (پیاوی خوادا) بە تایبەتی داوێنی کرا چڵکنەکەی راسپۆتینی ماچ کرد و سوپاسی بێ پایانی بۆ گەڕانەوەکەی پێشکەش کرد، بەوەی بوو بەهۆی ڕزگارکردنی خۆی و منداڵەکەی و خانەوادەیان لە نەمان.
بەڵام راسپۆتین ڕووی کردە شابانو، بە توڕەبوونەوە پێ ی وت:
- من کراومەتە نیشانگە بۆ شاڵاو پەلامارێکی زۆر، ئەویش بە لەکەدار کردنم لەوانەیە هەتا تۆش لێم کەوتبیتە گومانەوە، لەبەرئەوە وای بەچاك ئەزانم، کە سەر لەنوێ سەری خۆم هەڵگرم ئیتر بڕای بڕای بگەڕێمەوە بۆلاتان.

شابانو لەم بڕیارەی راسپۆتین داچڵەکی و بە دەنگێکی بڵند وتی:

–من باوەڕم بە تۆیە ئەی باوکی پیاوچاك، وەك چۆن باوەڕم بە مەسیح هەیە، هەرچی بە نوسین یا بەدەم دوژمنەکانت، ئەوانەی چاویان بە تۆ هەڵنایەت، ئەلکێنن بەئێوەوە، یەك تۆزقاڵ لە پایە و شوێنی بەرزی پیرۆزتان کەم ناکەنەوە، لای ئێمە، وە لەم لایەنەوە، باوەڕی تەواوت هەبێ ئەی باوکی پیرۆز و بەڕێزم!

بە بۆڵە بۆڵ راسپۆتین وتی:

–ئەزانی لە مۆسکۆ فڕێدرامە بەندیخانەوە؟!

– بەڵێ زانیم، دەك شەرمەزار بم! هەر وەخت بوو شێت ببم لە شەرم و تەریقی دا بەرامبەر بەو کردەوە ناشرینە، هەر لەبەر ئەمەش بوو کە نەخۆش کەوتم.

– ئەمە جوانە .... بەڵام ئەمەوێ (نیقی) بدوێنم لەمبارەیەوە، هەتا ئاگاداری بکەم لەو پیلانانەی بەدەستەوەیە ساز بکرێ لەدژی لەژێرەوە، دەبچۆ بیهێنە.

هەرچەند دەقیقەیەکی نەخایاند قەڕاڵیچە گەڕایەوەو جڵەوی قەیسەریشی بەدەستە بوو، ئەوەتا ئەیبا (خۆی بنوێنێ) لەبەردەم راسپۆتینا!

لەدوای سەلام لەیەکتر کردن راسپۆتین بەتوندی نەڕانی و وتی:

–برام نیقۆلا: لەپێناوی ئێوەدا گەلێکم پێ کرا، بەڵام هەر دانم بەخۆما گرت، لەکاتێکا کە لە مۆسکۆ بووم، سەرم قاڵ بوو بە جاویدانیەوە، خوا خستی یە دڵمەوە کە وردبیمەوە و سەرنج لە دوژمنانی تەخت و تاراجتان بدەم، بەم هۆیەوە لەدژم هەرایەك بەرپا بوو، گەلێ درۆ و دەلەسەی سەیر و نابەجێ خرایە پاڵم، بۆ تێکدان و هەرەس پێدانی پلەوپایەم لەلاتان، بۆ لەکەدارکردنی ڕاستی و دروستیم بەرامبەرتان بەو نیازەی لەبەرچاوتان

بکەوم.

قەیسەر بە پەلەبوو بۆ ڕازی کردنی بۆیە وتی:

– بەڵام وەك ئەزانی ئەی باوکە، لێیان ڕاپەڕیم هەتا ئەو ستەمکارییەیان لابەرم لەسەرتان.

– زۆر چاکت کردئەی نیقۆلای برام! .... چونکە ئەگەر من دەستبەردارت بم، بە مەرەت ئەبەن لەگەڵ خاو خێزانتا، ڕاست بوونەوەتان بۆ نابێ!

پاشان راسپۆتین کەوتە گێڕانەوەی چەند هاشەو هوشەیەك دەربارەی ئەو پلانانەی کە کتومت شۆڕشێکی نهێنی و تۆقێنەرە، بەم قسە بێ سەروپایانە دڵکرمێیی و رارایی قەیسەری هەڵئەگلۆفت، بە نیازی لەخشتە بردنی لەتەك شابانودا، هەتاوەکو بەوێنەی مێو هەردوکیان نەرم بوون لەناو لەپی دەستیا. پاشان بە قەیسەری وت:

– ئەزانی ئەی نیقۆلای خۆشەویست چ ناو وناتۆرەیەکیان ئەنێناوی لە نیشتمانە خۆشەویستەکەتانا، هەتا لەناو ئەو بەشە خەڵکەدا کە بە نزیك و دڵسۆزی تەختی حوکمڕانیتانی دائەنێن؟! نازناوی کۆڵۆنێلێکی هەڵخەڵەتاوت دراوەتە پاڵ، بەو بۆنەیەوە کە لە پلەکانی سوپادا لە کۆڵۆنێلێتی تێپەڕت نەکردووە، ئەمە لەکاتێك دا کە تۆ شازادەیەکی، هەروەها واش دائەنێن کە (مێردێکی هەڵخەڵەتاویشی)، وە دیسان ئەڵێن کە شابانو لە دۆستەکانی کۆنت (اورلۆن) بووە، کە لەم دواییانەدا لە میسر مردووە، لەگەڵ ئەوەش دا ئەڵێن جێنشین بەری ئەو پەیوەندییە ناشایستە هەڵبەستراوەیە.

بێگومان لام گرانە ئەم قسانە لەدەم و زاری منەوە بە ئێوە ئەگا، بەڵام چی بکەم ناچارم کە ئەبێ ئەو درۆو دەلەسە ئازاراوییانەت هەر بۆ بگێڕمەوە، چونکە پاڵ پێوەنەرم لە گێڕانەوەیانا هەر بەرژەوەندی تایبەتی

ئێوەیە، وە بۆ ئەوەی بزانن کە نزیکترین کەسانێك بۆ ئێوە بۆ لەناوبردنتان ئەگەرێ، وە یا هیچ نەبێ چاویان بە ئێوە هەڵنایە، بەو جۆرەی کە ئەبێ و پێویستە لەسەریان ڕێزتان لێبگرن بەو چەشنە نەهاتوونەتە پێشەوە، کە ئەبێ گەردن کەچ بن بۆتان بێ چەند و چوون بەوەی خاوەنی تاج و سەرۆکی دەوڵەت و کڵێسەی پیرۆزی سێبەری خوای لەسەر زەوی، نابێ ئەی نیکۆلای برام باوەڕت بە هیچ کامێکیان بمێنێ، باوەڕ بکە کە ناوەستن بۆ تەخت کردنی هەموو کۆسپێکی سەرەڕێیان بەو نیازەی هەر بگەنە ئەوەی دڵسۆزانتان لێتان بڕەنجێن وە یا لێیان بڕەنجێن، بۆ ئەوەی دووریان خەیتەوە، هەتا ماوەو دەرفەتیان دەست کەوێ بۆ تەراتێن کردن بە ئارەزووی پیسی خۆیان.

ڕاسپۆتین کەمێك بێدەنگ بوو، پاشان تێهەڵچووەوە:

– ئەگەر ناوناوە بۆتان دەرکەوتبێ کە ڕەوشتم گومان ئەخاتەوە، بەوەی بزووتنەوەم لەگەڵتانا دوورە لە ڕێزەوە، ئەوە با لێت ڕوون بێ کە ئەم ڕێگەیەم بۆیە گرتۆتەبەر هەتا دوژمنەکانتان بخەمە ناو داوو تۆڕەوە، بۆ ئەوەی وا بزانن منیش یەکێکم لەخۆیان، هەتا ڕاز و نیازی دەروونی شاراوەیان بدرکێنن.

بۆیە زۆر پەرۆشم کە ئێستا پرسیارێکی توند و تیژ و ڕێك و ڕەوانتان لێ بکەم، ئایا ئێوە باوەڕتان بەمن هەیە، باوەڕێکی تەواو بەبێ چەند و چوون، یا ئەو باوەڕە لەئارادا نیە؟ وە ئایا ئێوە ئامادەن پشت گیریم لێ بکەن لە هەموو کات و ڕۆژێکا هەر چۆنێك بێ ڕووکەشی ئەو ڕۆژ و کاتە، ئایا لەم ڕووەوە ئێوە بەڵێن و گفتتان چۆنە؟

قەیسەر بە دەنگێکی پچڕ پچڕەوە بە شڵەژاوی‌یەکی ئاشکراوە وتی:

–باوکە، سوێندت بۆ ئەخۆم کە ئێوە لەلام دوورن لە هەموو گومانێك، وە من هەرگیز پشتت بەرنادەم وە لەباوەڕم بەئێوە کەم ناکەمەوە هەرچی

ڕووبدا.

راسپۆتین ئەم سوێند خواردنەی قەیسەری بە هەموو ڕاستییەکەوە وەرگرت:

– من ئەم سوێند خواردنەت لەسەر ئەکەم بەماڵ...

پاشان پشتی تێکردن و بۆی دەرچوو، بەمە قەیسەری تورهەڵدایە ناو دەریایی ئەندێشە و لێکدانەوە لەو شتانەی کە بیروباوەڕی قەیسەری ورووژاند بوو.

بەم جۆرە راسپۆتین لە کۆشکی زستانە دەرچوو، توانی پتر لە جاران توانای خۆی بچەسپێنێ، بەجۆرێ تۆزقاڵێ مەترسی پاشە ڕۆژیشی نەمێنێ، بەم گورج و گۆڵییەی بەتەواوی ماوە بەرەڵا بوو کە دەستەی بەربەرەکانێ تەفرو تونا بکا، وە دەسەڵاتی خۆی بخاتە ڕوو بەبێ شەرم و شکۆ، وە ترسی زمان درێژی ئەم و ئەو وەبەبێ ترسی ئابڕۆچوون....

**گەرداو**

کاروباری ناو کۆشکی قەیسەری ڕوسی گەڵێ سەیر بوو، بەڵام چۆن سەیرێك، ئەوە هەر لە بەیانیەوە هەتا ئێوارە هەر کۆڕبەستن بوو، بۆ گێڕانەوەی گیان (ارجاع روح) خاوەنی کۆشك و دەس و پێوەندەکانی خوویان بەوەوە گرتبوو، کە هەر هێندەی ناوبانگی خاوەن دەسەڵاتێکیان بەر گوێ بکەوتایە، بەگورجی بانگیان ئەکرد بۆ ئەوەی کۆڕێکیان (ندوە) بۆ بگێڕێ، جا ئەمانە بە ویرد خوێندن و پاڕانەوە و بوخورد سوتاندن هەتا دوای نیوەڕۆیان ئەبردەسەر، کە تاریك داهات، ئەکەوتنە سەر پێگرتنی چۆنێتی هێنانەوەی ڕەوانی (روح) کەسێك لەوانەی چۆتە ڕیزی نەبووانەوە، لەریەنەوەی کاسە ئاوێ، یا جیڕەی مێزێك لە ژوورێکی تاریکا، یا شتێکی لەم بابەتانە، لای ئەوان بە نیشانەیەکی هاتنەوەی گیانی ئەو کەسە ئەژمێردرا کە بۆی دانیشتوون، بەم جۆرە کۆشك بووبووە گوزەری هەمە چەشنە دەست بڕو فاڵ گرەوەیەکی سوکی بێ نرخ!

بەشێوەیەکی هەمیشەیی سووکە لەشکرێك لەم جۆرە پیاوچاکانە ناو کۆشکیان تەنی بوو، لەوانەی کەرامەتیان ئەنواند، وەك دێوانە (میتیا) کە لەناکاو وەك مەڕ ئەی باعان، ئەم باعەباعەی ئەو هەموو سەرمایەیەکی ئەو بێ فەرە بوو، هەر ئەمەش بوو کردبوویە یەکێ لە دانیشتووەکانی ناو کۆشك!

ئای کە ژمارەی ئەو خوا پێداوانە کە لە شێوە و چەشن و بابەتی (میتیا) بوون چەند زۆر بوو، لە بەختگرەوە و ڕەمڵ لێدەرەوە وفاڵ گرەوەو لەپێ دەست خوێنەرەوە و فنجان هەڵهێنەر!

بێ گومان ڕاسپۆتین بەچاوی ڕەزامەندی سەیری ئەو پێرە دەست بڕە کۆنانەی ئەکرد، بۆیە سوور بوو لەسەرت پەرت و پەرەوازە کردنیان بە هەر نرخێ بێ بەوەی ئەیزانی، چەکی خۆی لە چەکی هەموویان بەهێزترە،

بەوەی توانایەکی لەپرادەبەدەری هەیە بەرامبەر ژنان بە سەروسیمای پیاوانەی خروسکی یەوە کە ئەمە لەکەسیکەیانا نەبوو، یارمەتی و پشتگیری ئافرەت لەم جۆرە شوێنە شڵەقاو و بازار شێواوییەدا گرنگیەکی تەواوی هەیە، ئەم لایەنە هەتا لە هەموو شوێنێکا بەبێ چەند و چوون!

بەڵام شوڵ هەڵکێشانی راسپۆتین، وە چەکی بێ وێنەو کاریگەری چاوەکانی لەگەڵ توانای هێزکردنی ئافرەتە شۆخ و شەنگەکانی چینی شلە شارییەکان و دەست وەشاندنی بەبێ ترس و لەرز بۆ ئەتك کردنیان، بەمانە دڵی پیاوانی کڵێسە لەخۆی رەنجان ئەوەتا ئەسقەف (نیۆڤان) کە یەکەم کەس بوو پەنجەی خواناسی بۆ راسپۆتین درێژ کرد –وەك باسمان کرد– لەبەردەم ژنانی چینی بەرزا، هێندەی نەخایاند کڵێسە و خەڵکی لە هەموو کەین و بەینی تێگەیشتن، بەهۆی درکاندنی نهێنیەکانی راسپۆتین لەگەڵ ئەو ژنانەدا لەکاتی دانیشتنی ئەو ئافرەتانە لەسەر کورسی پەشیمانی (کرسی الاعتراف) کەئەم کارە ناشایستانەش هەمووی لەژێر پەردەی ئایینا ئەکا!

لەبەرئەوە ئەسقەفی ناوبراو گەلێ تورە بوو، بەپرادەیەك لەگەڵ برادەرێکیا واتە لەگەڵ (ئەسقەف هرمۆچین)دا پۆژێکیان لەتەك چەند پیاوێکی ئاینی ترا پروویان کردە لای راسپۆتین، بەئاشکرا یەخەی راسپۆتینیان گرت و نەرانیان بەسەری دا:

– ئەی بەچکە شەیتان، ئەی بۆگەنترین کەس، ئەی زۆڵ و بیژی، وا ئێستا من لە رەحمەتی خوای گەورە بێ بەریت ئەکەم، و لە درەختی کڵێسە هەڵت ئەوەرێنم ئەی سەگی بە نەفرەتکراو، وە نایەڵم لەمەولا نزیك بیتەوە لە مۆمدانە پیرۆزەکان.

ئەسقەفی هەڵچوو بە هەموو هێزیەوە بە مستەکۆڵە ئەیکێشا بە تەپڵی

سەریا، پاشان چلیپایەکی قورس و گرانی زیوی گرت بە دەستەوە، بەنیازی ورد و خاش کردنی کاژەڵاکی جانەوەرانەی.

راسپۆتین کەوتە پەلەقاژە بە هەزار ناڵەی عەلی لە چنگیان قوتاربوو، سەرو پۆتەڵاکی خوێنی پیا ئەچۆڕایەوە، بەپەلە راسپۆتین خۆی کرد بە بارەگای قەیسەرا بۆ هەڵرشتنی سکاڵای لەدەست کردەوەی دەستەی قەشەکان، بەو نیازەی قەیسەر هان بدا بۆ هێنانەدی و بەکارهێنانی سوێند و پەیمانەکەی کە گرێدراوە لەگەڵیا.

کە گەیشتە لای قەیسەر .... دەسی کرد بە نەڕەنەر، کەوتە هەڵچنینی تاوان لەسەر ئەسقەفەکان بەوەی ئەیانەوێ پیلان ساز بکەن بۆ کوشتنی لەڕۆژی ڕووناکا. وە پێی داگرت لە دوورخستنەوەی ئەسقەف نیۆڤان وە ئەسقەف هرمۆچین لەگەڵ ئەو قەشانەدا کە هاوبەشیان کردبوو لەگەڵ (گەلەکۆمەکییەکەیانا) بۆ دەرەوەی وڵات!.

قەیسەر بەڵێن و گفتی خۆی بردە سەر، هەر دەم و دەست ەم داخوازییەی بەبێ کەم و کورتی جێبەجێ کرد، ئەم بڕیارە پڕدادە! بوو بەهۆی بەربەرەڵایی و چۆڵ بوونی چوار کورسی لەڕیزی ئەسقەفەکان دا، بەمە راسپۆتین جێگای دۆزیەوە بۆ بەرنابای کۆنە برادەری و بۆسێ میچی قومارخانەی لەو بەشان و شەوکەت ترا!

ئا بەم جۆرە راسپۆتین گەیشتە پۆپەی دەسەڵات لەناو پیاوانی کڵێسەی ارسۆدۆکسیدا بەهۆی ئەو چەند پیاوەوە کە لە بەکرێ گیراوەکانی خۆی بوون، لەهیچ خراپەیەك نەئەسڵەمینەوە!

وە بەوەی بەر لەم دەست وەشاندنەی دەستی لەڕیزی باڵبازی نهێنی هەروەها باڵبازی ئاشکراش وەشاندبوو، بەوەی ڕیزەکانیانی پڕکردبوو لەلایەنگرانی خۆی لەپلەی یەجگار بەرزا، بەم جۆرە قەڵغان و سوپێری خۆ پاراستنی لەخۆی گرێدا بوو، لەڕووی دەسەڵاتی هەڵسوڕاندنی کاروباری

دەوڵەتی و ئاینیشەوە، وە بەربەرەڵا بوو کە بە ئارەزووی خۆی گەمە بکا لە سەرانسەری ڕوسیادا بێ سڵکردنەوە!

ئیتر وەك راسپۆتین بەم دەسەڵات و بەو باوەڕەوە بەڕاستی بووبێتە قەیسەری ڕاست و دروستی وڵاتی ڕوسیا، کە لەم بارەوە دڵنیا بوو بەوەی هەموو شتێکی بۆ ئەچێتە سەر، کەوتە بیرکردنەوە لەوەی کە قەرزاری خۆیەتی بەوەی کاتی ئەوەی هاتووە کە لەمەولا داسەکنێ و بەری ڕەنج و ماندووبوونی خۆی بخوا پاش ئەوەی دەوڵەتی بۆ خۆی دامەزراند و دەسەڵاتی خۆی دابڕی بەسەر ورد و درشتدا.

سەیر ئەوەیە وەم نەگریسە هێشتا گۆندی بۆکرۆنسکی لەیاد نەکردووە، کە شوێنی لەدایك بوونێتی، چوو بۆ سەردان و دیدەنی گوندەکەی بە دەست و دایەرەیەکی ئەوتۆوە کە هەر لە تەدارەکی جیهانگیرە گەورەکان ئەچوو، نیازی ئارام گرتن و حەسانەوەی هەبوو لە دێری ژنە ڕەبەنەکان، کە لەوێ هەر لەسەر خەرجی خۆی دروست کرابوو، کە ژنە گیانیەیە کۆنەکانی تیایا ئەژیان، (جوزیفا)بوو بووە سەرکار و بەڕێوبەری دێرەکەش خوشکەکەی ئەسقەف بەرنابا بوو، ئەوەبوو باسی سەرگوزشتەی ئەویشمان کرد، لە چوونەکەی راسپۆتینا بۆ مۆسکۆ.

بەرنابا هەموو زەوی و زاری نزیك بە گوندی بۆکرۆنسکی کردبووە وەقفی ئەو دێرە، بەم جۆرە هەموو هۆیەکی ژیانی بۆ راسپۆتین پێك هێنا بوو.

بەم تەرحە راسپۆتین سەر لەنوێ شابانوی بەجێهێشت، هەتا ماوەیەك بەربەرەڵابێ بۆ وەرزشی گیانی، بۆ ئەوەی کەمێك بحەسێتەوە لە تێکەڵی بە خەڵك و دوور بوونەوەی لە کاروباری جیهانی کە لەگەڵ خروسکی ئەوا نەئەگونجا.

بێگومان شابانو زۆری لەبەرا پاڕایەوە، بەڵام گوێی نەدایە، چونکە

گەردن کەچی بۆ خوا پێویست ترە لە ڕەزامەندی شابانو! ئەوەشی لە بیر نەچووەوە کە پێشەکی بقڕێنێ بۆ تێکچوونی تەندروستی جێنشین لەدوای دوورکەوتنەوەی.

لە نوکەوە تێهەڵچوونەوە!

ڕۆژێ بوو لە ڕۆژانی زەماوەندی ژن چاکێکی پیرۆز (لە هەڵبژێراوانی خوا) کە لە دەرودەشتی سیبیریادا خۆشەویستە، لەم ڕۆژەدا قەشەکان بە جلوبەرگی تایبەتیەوە ئەکەوتنە تەقنەی فەقێ لەناو ماڵە جوتیارە پەرت و بڵاوەکانا، دەستیان بە بوخوردان و دەم بە بلوێربوون هەتا پتر خێروبەرەکەت دابارێنن بەسەر ئاژەڵ و مریشک و جوجەڵەکان دا لە کۆلیتە چەپەڵەکانیانا..

هەمیشە خاوەن کۆلیتەکان نوێژ و خێروبەرەکەت دابەش کردنی ئەم قەشانەیان بەدیاری وەك مریشك و هێلکە ئەگۆڕیەوە جارجارەش بەکەلەرم.

جگە لەمانە قەشە لە هەر ماڵە ئەبوایە پیاڵەیەك ڤۆدگا فڕ بکا، لەسەر نەریتی کۆنی ڕوسەکان، ئەمەش هەمووی لەبەختی ئەو ژنە پیرۆزە داوێن پاکەی نێژراوە.

کە ئێوارەیان لێهات، ورگی ئەم قەشە بەڕێزانە وەك کوڵانی تەنگەبەری لێهاتبوو چاوەکانیشیان وەك گلۆپ داگیرسابوو، بەهۆی ئاگر و تینی ئەو هەموو شەرابانەی هەڵیان دابوو هەر لەبەرئەوەی بەلاش و خۆڕایی بوو.

لە گەرمەی ئەو جەژنەدا بوو کە راسپۆتین تەشریفی گەڕابووەوە ناو خزم و قەوم و قیلەی، لەبەر سەرخۆشی لای لەموو ئەکرد، جوتیارەکان گەورەترین پێشوازییان لێ کرد داوایان لێکرد کە هاوبەشییان بکا لەو شایی و زەماوەندی خواردن و خواردنەوەیەدا، هەتا کۆنە قەشەی گوندەکەیان ئاگای لای دووبەرەکییەکەی ڕابردوویان نەما، بە ڕوویەکی

خۆشەوە بەپیریەوە چوو، بەڵام راسپۆتین هێندەی نەخایاند لەم قار و قیژەی ئەوان وەرس بوو لە زەماوەندەکە خۆی کێشایەوە، ڕووی کردە دێرەکەی کە ژنە ڕەبەنەکانی لێ بوو، واتە ژنە گیانیەیە کۆنەکانی، کە بەگەرمەوە چاوەڕوانی بوون، لەژوور هەموویانەوە (دایکی خۆشەویست) خوشکی ئەسقەف بەرنابای گەورە و گران!

لە ڕاستیا دەستی شاراوەی ڕۆژگار گەلێ سەرمە قولاتی بە راسپۆتین دابوو بەر لەوەی بە پەیژەی ژیانا بگاتە ئەم پلەو پایەیە، لەگەڵ ئەوەشا هێشتا لە زەوقی جوتیارێکی سیبیریادا مابووەوە، بۆیە هەمیشە ئەو ژنە دێهاتیانەی بەلاوە پەسەندتر بوو کە لەش و لاریان تێرو تەسەل ترن لە ژنانی شارستانی، ئەگەرچی سەردەمێکی دوور و درێژ ئەو بووکە شلەشاریانەی چینی بەرز ئاوی چاویان بردبوو، بەڵام زۆری نەخایاند، وازی لێهێنان پاش ئەوەی تێری لێ خواردن، وا ئێستا سەرلەنوێ بای داوەتەوە سەر بەژن و باڵای ئەو ژنە کۆچەریانەی کە پترس بەرگەی سەختی ژیان ئەگرن، وە زووتر رام و هۆگری ئەبوون، بەبێ ماندوو بوون، بە پەنابردنە بەر پەیرەوکردنی فوفێڵ لەوانەی ناو داستانە بێ سەروبەرەکان، ئەو چیرۆك و داستانانەی خوێنەرانی چینی بەرز خوویان پێوە گرتووە.

بەر لەوەی راسپۆتین لە دەرگای دێرەکە بچێتە ژوورەوە، کەمێك وەستا، چاوێکی پڕ لە خەشمی بڕییە خانووبەرە کۆنەکەی کە بریتی بوو لە کولانەیەکی وا کە هەر بۆ مەڕ و ماڵات دەست ئەدا، لەگەڵ ئەوەشا هێشتا هەر شوێنی ژن و مناڵە شەرعی یەکانێتی!

راسپۆتین ڕەزامەندی بەرامبەر بە زرنگی و زیرەکی خۆی پیشان دا، بەوەی توانیوێتی خۆی دەربازکا لەژێر باری هەژاری و پەیوەندی خۆی بڕێ لەگەڵ تەمەڵی و نەبوونی و بێ دەرەتانیدا.

لە دەرگای دێرە تازەکەی‌دا- دێری ژنە ڕەبەنەکان- یا شوێنی ژنە گیانی‌یەکانی، ئەم دێرە پێک هاتووە لە کۆشکێکی پان و بەرین بە چاکترین دارێك دروست کرابوو، لەسەر شێوەو نەریتی خەڵکی سیبیریا لە خانوبەرە دروست کردندا، دیوارەکانی بە مۆمدانی گرانبەها و پیرۆز ڕازابووەوە، وردەکاری زۆریان تیا نوێنرابوو، دانیشتوانی کۆشکی قەیسەری بەدیاری وە بۆ ڕەزامەندی دڵی راسپۆتین پێشکەشیان کردبوو، لەناو ئەو مۆمدانانەدا دوو وێنەی گەورەی خاوەن شکۆ قەیسەر و شابانو کە بەدیاری نێراوی هەردوکیان بوو هەڵواسرابوون.

بەڵام کەلوپەلی ناو دێرەکە سادە و هەژارانە و هەرزان بابەت بوون، لەگەڵ ئەوەشا هەموو مەرجێکی حەسانەوەیان تیا بوو، بەڵام چێشتخانە، کە ئەمە گرنگی‌یەکی تایبەتی هەیە لای راسپۆتین- زۆر ساز و لەباربوو، بەجۆرێك ئەتوانرا نایابترین خۆراك بە کەمترین کات بدا بەدەستەوە بۆ گەورەترین ژمارەیەك لە میوانی نانخۆر.

راسپۆتین لەبارەی چێشتخانەوە کەلێ بەتوندی گرتبووی، چونکە (زاتی پیرۆزی) وای دا نەنابوو خۆی بە ڕۆژو گرتن و سك هەڵگوشین خەریك بکا، لەو گۆشەگیریەی لەناو ئەو دێرە دوور و تەریکەدا!

چونکە مەبەستی راسپۆتین لە ڕۆژوو گرتن و گەدایی ئەوەبوو کە خەڵکی پترس بورگ لەخشتە بەرێت، هەتا بە پیاوێکی جاویدی ڕۆژوگر و جیهان نەویست بناسرێت، وە بتوانێ لەژێر ئەم پەردەیەدا قەپ بۆ بەری هەموو خۆشیەك ببا!

چوونە ژوورەوەی راسپۆتین بۆ ناو دێرەکە، بەجارێ ئاودێری خروشان، ژنە رەبەنەکانی بە هاوار هاواری هێستری‌یەوە پێشوازییان لێ کرد، پاڵە پەستۆیان بوو بۆ کڕنوش بردن و کەوتن بەسەر پێڵاوەکانیا بۆ ماچ کردنی، هەروەك چۆن چمك و داوێنی کراسە پەڵە پەلاویە چڵکن و

ڕۆناوییەکەیان ئەلستەوە!

خۆ ئەوە پێی ناوێ (جوزیفا) لە هەموو ژنەکانی بەجۆش و خرۆشتر بوو، چرپوچاوی خۆی نقوم کردبوو لە جۆگەلەی فرمێسکی چاوەکانیا، کە بەسەر گۆنەی داگیرساوی بەگڕی خۆشی و بەختیاری ئەهاتە خوارێ، بەوێنەی گرانەتادار ئەی بزڕکان و ئەی وت:

– خوایە لێت بەزیا بێ کە سەروەرمان گەڕایەوە و دەستمان کەوتەوە.

لەم شوێنەدا راسپوتین وەك کەڵەشێری غوباب ئەهاتە پێش چاو کە لەناو کۆمەڵە مریشکێکا بەرەڵا بووبێ، مریشکەکان بەچواردەوریدا بێن و بچن و بە دەنووك پەڕوباڵی پاك بکەنەوە!

راسپوتین هەستی بە بلیمەتی خۆی ئەکرد، کە چۆن ئەم دێرەی دروست کرد بۆ وچان و گرتنی بۆ هەڵمژینی بای نیشتمان و شوێنی لەدایك بوونی، کە هەستی خروسکی هاندەر و پاڵ پێوەنەری بوو بۆ خۆبەستنەوە بەم جۆرە ژیانەوە.

ئەو چەند ڕۆژە ژیانە سەرەتاییەی راسپوتین لەناو ئەم دێرەدا مەگەر هەر بە خەو و خەیاڵیا هاتبێ، بەڵام وا ئێستا وە لەناکاو دەستێکی نهێنی شاراوە نەوی بێ لەباڵی و فڕێی دابێتە بەهەشتێکی ڕاستەقینەی تەواوەوە، بەو ڕەنگە ئەم ژیانە تازەیەی ئەهاتە پێش چاو.

ئەوەی پتر ژیانی بۆ کرد بوو بە بەهەشت ئەو زێڕ و دراوە لەژمارە بەدەرە بوو کە بەئاسانی چنگی کەوتبوو بەهۆی بەخشندەگی ژنە لایەنگرە دڵسۆزەکانی پترس بورگییەوە، شەرابی کۆن و نوێ وەك ئاوی ڕووبار بێ بێبڕانەوە ئەڕژایە پیاڵەو پێکەکانیانەوە، بەدرێژایی ڕۆژ و هەتا درەنگی لەشەو، مێز و خوانی خۆراکیان، لەبەر لێشاوی زۆری خواردن و خۆراکی هەمە چەشنەی نایاب هەر لەوە ئەچوو لە ئاسمانەوە بۆیان بێتە خوارێ یا لەگەڵ هەوارا بۆیان بباریێ بۆ ئەم قەشە ورگ زلە زۆر خۆرە هەروەها بۆ هاو نیشتمانییەکانی لە جوتیارە توند و تۆڵ و دارێژراوەکان، ئاو و بای ساردی

سیبیریا خەڵك فێرە زۆر خۆری ئەکا، هەروەك چۆن ماوەی ژیان نادا بە منالێك ئەگەر توند و تۆڵ نەبێ، ئەوەی بەم جۆرە ژیانە قاڵ بووبێ دوور ئەبێ لە ناسکیەوە بەرگەی شەکەتی ئەگرێ، لەهەمان کاتیشا بەپەرۆش ئەبێ بۆ خواردن و خواردنەوە هەتا قەوارەی پتەو دارێژێ.

بێگومان راسپۆتین بەختەوەر بوو بە بەردەوام بوونی ئەم زیافەت و زیافەت کاریەی چونکە لەگەڵ ئەو ژنانەدا ئەژی کە لە قوڕی خۆی دروست کراون، هەستی بە خۆشی رابواردن ئەکرد لەگەڵیانا و پەژارە و ئاوارەیی لێ دوور ئەکەوتەوە.

هەر کە ژنەکانی لەتەکیا سەرخۆش ئەبوون و ورگیشیان لە خواردن و خواردنەوە هەڵئەخانی و تەواو تێروتەسەل ئەبوون، لەسەر ئەو خوانەی کە خواردنەکانی لەبن نەئەهات، بەبێ شەرم و شکۆ خۆیان ئەهاویشتە باوەشیەوە بە هەموو جۆش و خرۆشانێکەوە، نەك وەك ژنە بەرزەکانی پترس بورگ کە خاو و خلیچك بوون، هەر لە کۆنە سیپاڵی دڕاو ئەچوون، ئای کە راسپۆتین چەند بەختیارە بەم ئافرەتانە کە بەتەواوی هەستی ئەوروژێنن وەك زۆرانگرێك (مصارع) کە توشی هاوشانێکی خۆی ئەبێ لە کێشەی زۆران گرتنا، ئەمیش هەر بەو جۆرە بەپەرۆشە بۆ زۆران گرتن لەگەڵ ئەو ژنانەدا کە زمانی ماسولکە تێئەگەن، توانا و دەسەڵاتی ئەوروژێنن.

**ئاڵۆزیی نێوان ئافرەتەکان**

راسپۆتین ژیانی لەسەر نەریتی تایبەتی خۆی ئەبرد بەڕێوە، دەست درێژی بۆسەر ئابڕووی ژنان و پاشان تۆبەکردنیان لەسەر دەستی خۆیا، بەنیازی کۆکردنەوەی خێرو بەرەکەتی بێ پایان بە پاك کردنەوەیان لە تاوان بە تۆبەکردنی جار لەدوای جاریان، بەوەی هەرچەند تاوانەکەیان گەورەتربێ، لەدوای تۆبە و پەشیمانی خێریان پتر و گەورەتر ئەبێ.

بەڵام سروشتی ژنە گیانیە سیبیریاییەکانی و هێزی قەوارەیان و زۆری خواردن و خواردنەوەیان، کە پاش سەریان تێ کردبوو، وایان لێهاتبوو، کە

ماوەی تۆبە و پەشیمانی‌یان درێژە نەکێشێ، بۆیە زۆری نەئەخایاند کە بەبێ شەرم و شکۆ تۆبەکەیان ئەشکان و لەکاری خێر تێهەڵ ئەچوونەوە.

کە راسپۆتین هەفتەی یەکەمی بەسەربرد، سەیری کرد پێویست بە پات کردنەوەی ئەم جۆرە لاسایی‌یانە نیە، بۆیە بەری بەرەڵاکرد کە وەك سوڵتانێ لە سوڵتانەکا وڵاتی هەزار شەو و شەوێك (بلاد الف ليله و ليله) بژی لەناو کەنیزەکەکانیا، بەڵام ئەبێ کەنیزەکی کام شازادە و سەرداری ئەوەندەی ئەم کەنیزەکانەی راسپۆتین هۆگر و سوتاوی ئاغایان بووبن، بەراستی ڕابواردنی راسپۆتین لەناو ئەو ئافرەتانەدا لە هەموو ئاسیادا بێ وێنەبووە!

تەنیا تاقە شتێك دڵی راسپۆتینی ئوگووشی ئەویش ئەوە بوو ژنە گیانی‌یەکانی لەناو خۆیانا بەگژ یەکا ئەچوون لەکاتی گێڕانی ئەو زەماوەندە ئاشکرایانەی کە پێکی ئەهێنا بۆ شەیتانی لەشی لەبەر چاوی ئافرەتەکانی تر.

(دایکی بەڕێز) بەڕێوەبەری دێرەکە لە هەموویان توند و تیژتر بوو لەیاخی بوون و سەرکەشی کردنیا، بەتایبەتی لەبەربەرەکانیا لەدژی (جوزیفا) بەوەی لە هەموویان پتر خۆی بەستبووەوە بە خۆشەویستە پیرۆزەکەیەوە!

هەروەها ژنە گیانی‌یەکانی تری شەڕو دەمەقاڵێیان ئەبوو بۆ خۆبردنە پێشەوە لە راسپۆتین، کە ئەم هەراو دەمە قاڵی‌یەی ئەوان ئەو خەیاڵ و خەوە خۆشەی لێ تێکئەدا، چونکە ئەو ئەیویست هەموو شتێك بەهێمنی بڕوا.

بۆیە راسپۆتین پەشیمانی دەربڕی بە دوورکەوتنەوەی لە خانمانی بەرزی پترس بورگ کە سەلارە و بەسەلیقە بوون، بەگژیەکا نە ئەچوون و شەڕیان لەسەر نە ئەکرد لەناو خۆیانا.

ڕۆژێکیان کە نەیتوانی پێکیان بهێنێ، گەیشتە تینی پێی وتن: کە بەجێتان ئەهێڵێ و ئەگەڕێتەوە بۆ ڕوسیای ئەورووپی، هەر ئەم وشەیە لە دەمی راسپۆتین دەرپەڕی هەموویان کەوتنە پەلەقاژە و دەست کردنە ملی یەك و یەکتر ماچ کردن و ئاشت بوونەوە، کەوتنە سوێند خواردن بۆی کە بە

ئاسـودەیی لەگـەڵیا ئـەژین، بـەڵام راسـپۆتین نـەرم نـەبوو لـە بڕیـاری بـەجێ هێشـتنیان پاشـگەز نـەبووەوە، ئەمـە لـە کاتێك دا کـە پۆسـتە هـەموو ڕۆژێـك پەیام و نامەی پاڕانەوەی شابانوی بۆ ئەهێنا، کە بگەڕێتەوە بۆ ڕزگارکردنی ژیانی جێنشین لە مردن، چونکە تەندروستی ڕوو لە مەترسی یە لـەو کاتـەوە کە راسپۆتینی پیرۆز پترس بورگی بەجێ هێشتووە.

ئەم پەیامانە لەبەر دڵی راسپۆتین خۆش ئەهات، چونکە هـەمووی ئـەوەی ئەسـەلماند کـە جێنشـین بـەبێ راسپۆتین هـەڵناکا و ناژی، هـەروەها (ئانـا)ی دۆسـتی بـە دوورو درێـژی حـاڵ و ئـەحواڵی نـاو کۆشـکی قەیسـەری بـۆ ئەنووسی.

ئەمە لەکاتێك دا لەو ئافرەتە سیبیریانە تێری خواردبوو، وای بەچاك زانـی بـەجێیان بێڵـێ و بگەڕێتـەوە بـۆ سـەر کاروبـاری گـەورە و گرانـی بـۆ سـەر پێگرتنـی ئــەرك و پێویسـتی‌یە پیرۆزەکـانی سەرشـانی لــەناو کۆشـکی زستانەدا.

ڕاپۆرتــەکانی (ئانــا) ئــەوەیان ئەگەیانــد کــە نوقلانــەکانی راسـپۆتین وا لەبـەرەوە یـەك بەدوای یـەکا دێنـە دی، بـەوەی خـەڵکی هـەموو هەسـت بـەو بۆشـایی‌یە ئەکــەن، کــە لــە نــەبوونی و دوورکەوتنــەوەی (پیـاوی پـیرۆز) کەوتۆتـەوە، بۆیـە هـەموو دەسـت و دایـەرەکان نوێـژو ویردیـان ئەخوێنـد و کوفیان ئەکرد بەیانیان و ئێواران هـەتا خوا دڵـی (پیاوی هەڵبژاردەی)خۆی لاله کریکۆر نەرم بکا و بیخاتە سەر ڕێگای گەڕانەوە.

راسـپۆتین دێرەکـەی بەجێهێشـت، دوو پیـاو لـە باڵبـازە نهێنیـەکان دوور و نزیك دووی کەوتبوون، خۆیان لە خەڵکەکە گۆڕی بوو لەجلوبەرگی بازرگانی دا بەنیازی پارێزگاری لە ژیانی راسپۆتین، لەگوندی بۆکرۆنسکی مانەوە بەو بیانووەی هـاتوون جوانووە ولاخ واتـە نۆمـا ئەکڕن، بـەڵام هەمیشـە نرخێکـی زۆر کـەمیان ئـەدا، هـەتا جوتیارەکـان قایـل نـەبن بـە فرۆشـتن، ئـەم سـەواو مامەڵەیـەیان بـەردەوام بـوو هـەتا کـاتی بڕیاردانەکـەی (بـاوکی پـیرۆز) بـۆ

ڕۆیشتن ئەو کاتە ئەوانیش کەوتنە ڕێ لەگەڵیا.

راسپۆتین جارێکی تر دارستانەکەی بەجێهێشت، هەتا بەگورجی بگاتە یەکێ لە ئێستگەکانی ڕێگای ئاسنی سیبیریا بۆ پترس بورگ کە گەیشتە یەکێ لە ئێستگەکان مایەوە چاوە چاوی هاتنی شەمەندەفەری ئەکرد، کاتی چاوەڕوانی بەخواردنی ڤۆدکا بەسەر ئەبرد بەوپەڕی گورج و گۆڵی یەوە.

لەکاتێکا وا راسپۆتین نوقمە لەناو خۆشی ئەم نەریتە جوانەیا لەناکاو شتێکی سەیری کەوتە بەرچاو، ئەویش بینی یەکێ لە ڕەبەنەکان بوو (جۆزیفا)ی مێشك شڵەقاو کە نەیئەتوانی ئارام و سەبوری خۆی بهێنێ بە وەرزشی گیانی دوور لە راسپۆتین، وا ئێستا هاتووە کە راسپۆتین قایل بکا لەگەڵ خۆیا بیبا بەوێنەی جاری یەکەمی لەناو بەرفرەکەدا ئەوەبوو بۆی نەچووە سەر.

(جۆزیفا) گەیشتە ئێستگە بە ڕەنگێکی زەردی هەڵبڕسکاوەوە چاوەکانی چوو بوون بەقوڵا، وەك تازە لە گۆڕ دەرچووبێ وابوو، لەڕاستیا ئەم ژنە توڕەو کەللەپی بوو، بەوێنەی کەسێ کە نەخۆشی هیستری بیگرێ یا ئەوانەی حاڵیان لێدێ لەکۆڕی زیکرا، ئەم ژنەش ئێستا دەق وابوو.

(جۆزیفا) لەبەردەم راسپۆتینا قیت بووەوە داوای مافی خۆی ئەکرد لە خۆشەویستی یا بۆ مێردە گیانی‌یەکەی کەچی راسپۆتین خۆی لێ بەخاوەن نەکرد، گوێی نەدایە لەوەبەولاوە کە دەستێکی لێ بادا و شانێکی لێ هەڵتەکان نیشانەی گاڵتە پێکردنی!

بۆیە شێتی گرتی، بەگورجی خەنجەرێك کە لەژێر سنگیا شاردبوویەوە چابووکانە لێی ڕاکێشا، ئازایانەش هەڵیکوتایە سەر خۆشەویستەکەی کە ناپاکانە بەجێی هێشتووە، لەچاو تروکانێکا خەنجەری لەورگی راسپۆتینا ڕادا، ئەوانەی دەورو پشتیان نەبووایە کە فریا کەوتن گیانی راسپۆتینی بە دۆزەخ ئەگەیاند، بەلام ئەوان توانیان خەنجەری خوێناوی لەدەست ئافرەتەکە وەرگرن لەپاش پەلەقاژەیەکی تەواو کە لەو ئافرەتە ڕانەئەبینرا.

بەڵام راسپۆتین سەرەڕای برینەکەی ئەوەی لەبیر نەچوو کە بەڕوویا بشیڕێنێ:

-ئای کە چەند سەگێکی پیسی! پیاوکوژ!

بەگورجی پیاو چاکیان گەیاندە نەخۆشخانەی شارێکی نزیک، ئیتر بروسکەی دەست لێوەشاندن لەپیاوی گەورە و گران سەرانسەری وڵاتی گرتەوە، کە هەواڵ گەیشتە شابانو، دڵی داخوریا، داوای کرد کە هەموو کاتژمێرێك راپۆرتێکی پزیشکی بەبروسکە بۆ لێبدرێت، ئیتر بەشەو بێ یا بەڕۆژ، بۆ دڵنیا بوون لە دروستی پیاو چاك.

لەگەڵ ئەوەشا شپرزەی قەڕاڵیچە درێژەی نەکێشا بەوەی پزیشکەکان دییان لەدوای تەنیا هەفتەیەك برینەکەی گۆشتەوەو زوونی هێنایەوە، بەم جۆرە درندەی ئەفسانە لەماوەی هەفتەیەکا وەك گوێزی ساغی لێهاتەوە، سەر لەنوێ کەوتەوە ڕێگا، وەك نە بای دیبێ و نەباران، ئەگەر کەسێکی تر بووایە ئەو برینەی ئەوی پێوە بووایە هەر یەکسەر ئەمرد یا هیچ نەبووایە بەلای کەمیەوە ئەبوو دوو مانگی ڕەبەق لە جێگادا بکەوتایە.

ئەم چاك بوونەوەیەشی هەر بووە ئەفسانەیەکی تر بەوەی موعجیزەی فریشتەکان چاکیان کردووەتەوە!

بەڵام لەڕاستی دا تەندروستی بێ وێنەی بووە هۆی دروست بوونەوەی ئەو هەموو خوێنەی لێی ڕۆیشت بوو بە خێراییەکی نەبینراوی ئەوتۆ، کە کوشتن و لەناوبردنی لە مەحاڵ ئەچێت.

بێگومان ئەم ڕووداوە گرێیەکی لە دڵ و دەروونی راسپۆتینا دروست کرد، لەوەو پێش بە خەیاڵیا نەئەهات کە کەسێکی وەك (جۆزیفا) ئەوێرێ پەلەقاژە و هەنگاوی وا هەڵبگرێ، ئەو جۆزیفایەی کە پیایا ڕا ئەپەرموو ئامادە بێت لەپێناویا بمرێت...

ئەم بیرکردنەوەیەی لە کاتەکانی نوستنیا لەسەر جێگای نەخۆشی یەکەی لە نۆبۆڵسك، پەژارەیەکی زۆری پێ ئەدا، هەتا (بەرنابا)ی گەورە و گران کول

و کافر بوو تیایا بۆ دامرکاندنەوەی ئاگری هەڵچوونی کە ئەیخستە هاوار هاوار و بۆڕاندن وەك گامێش:

-با بەس بێت ئەوەی لە پیشەی گەدایی دەستم کەوت!! کە ئەمە ئەوەی ئەگەیاند کە ئەم نەگریسە خۆی باوەڕی هێنا بوو بەوەی ڕاستە پیاوێکی خواناسە، لەسەر ئەو شێوەیەی کە پیاو ئەکەوێتە خۆ هەڵخەڵەتاندن کاتێ ئەبینێ هەر خەڵکە و بەو هەڵخەڵەتاوە.

بەرنابای گەورە و گران هەر بەسەریا ئەهات و دڵی ئەدایەوە بۆ ئەوەی بێتەوە سەرخۆی بەم جۆرەی خوارەوە پێی وت:

-برام لالە کریکۆر پایەی بەرزی خۆت بهێنەرەوە بەرچاو، ئایا پێوەدانی زەردەواڵەیەك یا هەنگێ ئەبێ ببێتە هۆی کۆسپ لەڕێگای خواردنی هەنگوین لە دۆستە پیرۆزەکانت؟!

ئا بەم جۆرە بەرنابا بە قسەی قوت قوت هەڵی ئەخوێند بەگوێیا، کۆن باخەوان وا ئێستا فێری زمان لوسی و زاربادان بووە لەوکاتەوەی گەیشتبووە پلەی ئەسقەفێکی تەواو، ئەویش بەهۆی بەرەکەتی ڕاسپۆتینەوە.

ئەم هەموو قسە و ویرد خوێندنەی (بەرنابا)کاری خۆی کرد لە ڕاسپۆتینی برینداراا، توڕەیی ڕەویەوە، سەرلەنوێ کەوتەوە سەر کەڵکەڵەی برینی ئەو ڕێگا دوورو درێژەیەیان بۆ پترس بورگ، بەوپەڕی باوەڕو پشت بەخۆ بەستنەوە بۆ هەڵگەڕان بە چیای بەرزی پاشە ڕۆژی شاراوە و نەزانراودا.

قڕاندن

هەر ئەوەندەی ڕاسپۆتین گەیشتە ماڵەکەی خۆی لە شەقامی (حۆرد کۆفایا) هەواڵی گەڕانەوەی لە هەموو سوچ و قوژبنێکی پترس بورگ دا بڵاوبووەوە، وەك چۆن دەنگ لەناو ئەشکەوتا ئەزرنگێتەوە.

ڕووداوێکی سەیرو ڕێکەوتنێکی بێ وێنە هاوبەشی کرد لە بەدەرخستنی موعجیزەیەکی گەورەی ئەم پیاوە پیرۆزە نەگریسەدا، کە بووە هۆی ئەوەی

خەڵکی بە گرنگی سەرنج لە ڕاستی و دروستی ئەم نەگریسە بدەن، ئەویش ئەوەبوو کە دەستەیەك قەشە مۆمدانێکی پیرۆزیان ئەگواستەوە بۆ سەر جێگای نەخۆشێکی فێدار (تا چاك بێتەوە) لەسەر باوەڕی ئەوان، کە ئەم دەستە قەشەیە گەیشتنە سیلەی ماڵی ڕاسپۆتین، وا ئەوان بەڕێوەن، لەناکاوا ولاغەکان وەستان بەجۆرێ ئەو هەموو قامچیانەی دائەبارین بەسەر لەشیانا تەنیا بستێك لە شوێنی خۆیان نەئەجولان بەرەو پێش، خەڵکەکە کە ڕاسپۆتینیان بیرکەوتەوە کەوا مۆمدان گەیشتۆتە بەر ماڵی (پیاوی هەڵبژاردەی خوا) دەنگە دەنگی سەرسامی بەناو خەڵکەکەدا بڵاوبووەوە، هێندێکیان بە دەست کەوتنە کێشانی چلیپا لەسەر سنگیان، بەلام بێ هودە بوو، هەموو کەوتنە سەر ئەو باوەڕەی کە مەریەمی پیرۆز کە ئەو مۆمدانە دروشمی ئەوە نایەوێ ئەو دەبدەبەیە تێپەڕی بەر لەوەی ڕاسپۆتین سەلامی گەردن کەچی بۆ نەکا.

لەناکاو ڕاسپۆتین لەسەر پێپلیکەی ماڵەکەی بەدەرکەوت، دەست کرا بە چەپڵە لێدان و نەعرەتە کێشان، لە پاشانا بە وێنەی کەسێك وەحی بۆ بێتە خوارەوە، وردە وردە لە مۆمدانەکە نزیك بووەوە و چلیپای لەسەر سنگی کێشاو چەمایەوە بۆ کڕنوش بردن، پاشان ماچ کردنی دەستی مەریەم کە لەسەر مۆمدانەکە نەخشێنرابوو، هەر بە لێبوونەوەی لەم کەین و بەینە، دەستێکی توندی لە ولاغەکان ڕاوەشان، هەر لەگەڵ ئەم دەست ڕاوەشاندنەی ئەوا ولاغەکان کەوتنە چوارناڵە، بەلام چۆن چوار ناڵەیەك هەر وەك بیانەوێ ئەو کاتە لەدەست چووە پڕکەنەوە کە تیا وەستابوون!

خەڵکێکی زۆر بەچاوی خۆیان و بەرێکەوت ئەو موعجیزە گەورەیەیان لە موعجیزەکانی ڕاسپۆتین دی، بەمە هەتا ڕاسپۆتین خۆی غوبابی گرتی و کەوتە ئەو باوەڕەوە کە ئەبێ خوا لە کردەوەکانی ڕازی بێ، بۆیە ئەم ڕووداوەی بۆ کرد بە ئایەتی بەرزکردنەوەی و درەوشانەوەی ئەستێرەی بەختەوەری لەناو خەڵکیدا!...

ئەمەش دیارە شتێکی کەم نیە، چونکە هەتا لەناو ئافرەتە داوێن پیسەکانا هەیە خۆی بە دڵپاك دا ئەنێ، بەوەی ئەبێ لە ڕەزامەندی خوا نزیك بێ، هەروەها لەناو ڕێگر و جەردەشا دیسان هەیە خۆی وا دائەنێ کە پیاو چاك و خواناسە، بەوەی یەزدان ئاگای لەناو دڵە، کە دڵ پڕ بوو لە خێرو چاکە، با دەست خوێنی ڕژاوی بێ تاوانیشی پیا بچۆڕێتەوە!

هیچ جێگای سەرسوڕمان نیە کە راسپۆتین ئەم ڕووداوە بە نیشانەیەکی باش و دەروویەکی خێر بۆخۆی دانابێ، وە یا بەداباریینی خێر و بەرەکەتێ، وەك ڕۆڵەی نازداری ئاسمان بێ لەسەر زەوی، هەر خۆشی بەسەردا ئەبارێنێ هەرچەند لە شەقامی ڕاستیش لای دابێ.

بەم باوەڕە تازەیەوە کە کۆڵەکەی خۆ ڕاگرتنی بوو ڕووی کردە کۆشکی زستانە یەکسەر لەسەر نەریتی خۆی، سەری خۆی کرد بەو ژوورەدا کە شابانو تیایا دۆش دامابوو بەدیار جێنشینەوە، کە لە کەنەفتی نەخۆشیەکەیا لەناو جێگادا کەوتبوو، لەدوای ڕۆیشتنی راسپۆتین بۆ سیبیریا بە هەفتەیەك.

کە شابانو چاوی بە راسپۆتین کەوت وا لە دەرگای ژوورەکە دێتە ناوەوە، قورگی پڕبوو لە گریان و هۆن هۆن فرمێسك لە چاوەکانی ئەهاتە خوارێ، لێرەدا قەشەی نەگریس بە شابانوی وت:

– مەگری ئەی ئەلکسەندەرا! وەك ئەزانی هەر گەردن کەچی خوام بەتەنها، بە فەرمایشی ئەو بە وەحی پێم وتراوە کە بگەڕێمەوە بۆ لاتان، بۆ ڕزگارکردنی بنەماڵەی قەیسەری.

پاشان ناوچەوانی دا بەیەکا لەپاش کەمێ بێدەنگی وتی:

– ئەگەر لەبەر خوا نەبووایە، بە گۆشەگیری خۆم لە سیبیریا ئەمامەوە، چونکە تەواو لە جیهان پڕم و نەفرەت و بێزی لێئەکەمەوە، هیچ شتێکم بەلاوە خۆش نیە وەك گۆشەگیری و خواناسی!

شابانو پاڕایەوەو وتی:

-ئەی باوکی پیرۆز! لە قوڵایی دڵەوە سوپاست ئەکەم، وەهەرگیز لەچاکەت دەرناچم خوا گەورەترین پاداش و چاکەت بداتەوە لە جیهانی دوایی‌دا کە لەم جیهانە چاکترە.

راسپۆتین لەسەر نەریتی جارانی بەسەر جێگای جێنشینا خۆی نوشتانەوە بەڵام ئەمجارە چاوی تێنەبڕی، بەڵکو سەری راوەشاند، پاشان خۆی شێواند نیشانەی مەترسی لە حاڵ و ئەحواڵی نەخۆشەکە و وتی:

- ئافرەت مناڵەکەت زۆر نەخۆشە .... وا دیارە دووریم درێژەی کێشاوە بۆیە وای لێهاتووە.

قەراڵیچە ئەلەکسەندرا گلەیی لە چارە ڕەشی خۆی ئەکرد ئەو کاتەی کە راسپۆتین پێی وت:

-بێدەنگ بە ئەی ئەلەکسەندەرا. لەخوا بپاڕێرەوە.

پاشان هێزی موگناتیسی چاوەکانی خۆی فڕێدایە سەر هەستی مناڵەکە لە ڕێگەی چاوەکانی‌یەوە، هەرچەند هەناسەیەکی نەخایان هەتا بە شابانوی وت:

- بنوارە! ئەوا تۆ ئەبینی کوڕەکەت بەرەو چاك بوونەوە ئەچێ، بەڵام هێشتا لە مەترسی دایە.

پاشان دەستی کردەوە بە قسە و وتی:

- وەکو ئەزانی لە ڕێگا توشی دەردەسەریەکی سەخت بووم، زۆری نەمابوو ئافرەتێکی شێت بە خەنجەر بمکوژێ، لەو کاتەدا کە بە ئازاری نەخۆشی‌یەوە تەب و تلم بوو لە سیبیریا، ئاسمان بەئاگای هێنامەوە بەوەی ئەگەر من لەناو بچم و لەم جیهانە کۆچ بکەم، ئەوە هەموو خانەوادەی خۆت و مێردەکەت ورد و درشتان بە کەفلەکونی ئەچن بە ناخی ئەرزا، بە گورجی ئێوەش بەدواما دێن، من بەهەر دەردێك بڕۆم و کۆچ بکەم لە ژیان ئێوەش هەر بەهەمان دەرد دەرئەچن، تەمەن و ژیانتان بەستراوەتەوە بە تەمەن و ژیانی منەوە، بە لەناوچوونی من ئایارتان بەسەر پایارتانەوە نامێنێت.

لەوانەشــە راســپۆتین ڕاســت بووبــێ لــەم دوا ڕۆژ خوێندنەوەیــەی بــە دووریشی ناگرین کە حاسەی شەشەمی هەبووبێ یا توانایەکی تایبەتی تر، بەڵام ئەوەی گومانی تیا نیە کە هۆشیاری و وردی و تێبینی و بێ وانەی زانیاری بە لێکۆڵینەوەی سەرەتایی بۆ ئەو بارە ئاڵۆزی ئەو ڕۆژەی ڕوسیا کە هەموو جۆرە خراپەیەك بەسەر یەکا ترشا بوو پیاوی زرنگ و هۆشیاری ئەگەیاندە ئەوەی بتوانێ نوقڵانە لێ بدا بۆ لەناوچوونی تەواوی ڕژێمی بۆگەنی قەیسەری، چونکە باری چاك و خراپی ڕژێمێك وەك سێبەری دارو درەخت وایە کات و ڕۆژی بێ ئەندازە ئەیگرێ.

راسپۆتین کە وەك بایەقوش ئەی قڕاند بە دەنگی گڕو قسەی پچڕ پچڕی، لە پێکەنین ئەچوو کە تێکەڵ بە گریان ئەبێ، بەمەدا لە جاودووگەری هۆزو تیرە دواکەوتووە هارەکان ئەچوو وە یا لە کاهینەکانی بەر لە خواناسی، کە هەست و گیانی مرۆڤیان ئەهێنایە هەژان.

بەڕاستی راسپۆتین لەم هەڵوێستەیا بیل بیلەی چاوەکانی پرشنگێکی بێ وێنەی لێ بڵند ئەبووەوە، چاوەکانی گەورە ئەکرد و بچوکی ئەکردەوە بە بزوتنەوەیەکی سەیر، وەك داگیرسانی چاوەکانی بەهۆی توانایەکی شاراوەوە بێ لە ژێر ئەو قەوارە قەبەو زەبەلاحەدا، چاوەکانی دەرگا بوون گڕی ئاگریان لێ ئەهاتە دەرەوە.

ئەم دیمەنە ترسێنەرەی و ئەو نوقڵانانەی کاری خۆی کرد بۆ سەر دەماری شلی شابانو، بۆیە قەڕاڵیچە لەترسا ئۆقرەی لەبەر هەڵگیرابوو، وەك خوا بە گەورەیی خۆی بە زمانی راسپۆتینەوە ئەو ترس و خورپەیە بخاتە دڵیەوە!

کە شابانو کەمێك ترسی ڕەویەوە، دەمی هەڵهێنایەوە بە لالانەوەیەکی زۆرەوە وتی:

– ئەی باوکی پیرۆز! لەبەرچی گومان ئەکەی کە دووچاری نەردی سەری ئەبی لە ڕوسیای پیرۆزدا؟! خۆ تۆ خۆشەویست و ڕێز لێگیراوی لەناو چین و توێژەکانی گەلا، کێ ئەتوانێت دەست درێژی بکاتە سەرت ئەی پیاوی خوا؟

راسپوّتین ناوچەوانی دا بەیەکا و وتی:

– چونکە من پیاوی خوام! وە ڕوسیا بۆتە ئەو وڵاتەی خوا بە نەبوو دای ئەنێ، لەبەرئەوە دواڕۆژی تاریکە، ڕووداو و بەسەرهات و کارەساتی زۆر ئەبێ، هەموو جۆرە خراپەیەك لە دەروونی خەڵکا پەنگی خواردۆتەوە هاکا لە ڕووی یەکا تەقینەوە!

شابانو سەری داخست و دایە پرمەی گریان، راسپوّتین هیچ دڵی نەدایەوە، هەر بەو ترس و تۆقینەوە بەجێی هێشت، هەتا پتر ببێتە مێو و ڕۆن لە قوڵی مشتیا.

## جەنگ

جەنگ بەرپا بوو[1]، ڕوسیای قەیسەری لە ڕیزی سوێند خۆرە ڕۆژئاواییەکان دا بوو لەدژی ئەڵمانیا، وا کاروباری ڕوسیاش بەم جۆرەیە: نیقۆلای دووەم قەیسەری ڕەسمی ڕوسیایە و راسپۆتین قەراڵی ڕاستەقینەی.

دوو ساڵی ڕەبەق حاڵ و ئەحواڵ بەم جۆرە ئەڕۆیشت بەبێ گۆڕان، ئەڵمانیا دوژمنی ڕوسیایە لەبارەی کاروباری سوپایی و دەوڵەتییەوە بەڵام لە ڕاستەقینەشا خۆشەویست و دۆستیەتی بە بارێکی تری دوور لە کارەساتی جەنگ.

ئەویش بەوەی قەراڵیچە لە نەژادی ئەڵمانەکان بوو، دڵ و دەروون و مێشکی پڕ لە خۆشەویستی ئەڵمان بوو وە لە هەمان کات دا ئاخنرابوو بە خەشم و قین لەدژی ڕوسەکان، راسپۆتین خۆی داسەپان بەسەر هەست و دەمارو گیانیا بەوەی ئەویش هەر لەسەر بیروباوەڕی قەراڵیچە بوو ئەگەر چی لە ڕووکەش و ڕواڵەت دا بەم جۆرە خۆی نانوێنێ.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشا راسپۆتین و قەراڵیچە بەجووتە نەیان توانی بوو قەیسەر لەسەر بیروباوەڕی خۆی پاشگەز بکەنەوە،ئەم پیاوە بودەڵە هێمنە زۆر توند خۆی بەستبووەوە بە پێویستیەکانی شەرەفەوە هەرگیزاو هەرگیز قایل نەبوو ئەو پەیمان شکێن بێ، لەگەڵ سوێند خۆرانا، سوور بوو لەسەر ئەوەی ئەبێ هەتا دوایی لە ڕیزیانا بووەستێ.

بەڵام راسپۆتین –لەگەڵ ئەو هەموو لوت بەرزی و لەخۆبایی بوونەیا– ئەوەی بەتەواوی ئەزانی کە درکاندنی هەست و بیروباوەڕی ناو دڵ و دەروونی، ئەنجامی بەباشی ناگەڕێ، لەبەرئەوە لەبەردەم خاوەن شکۆ قەراڵا لافو گەزافی نیشتمان پەروەری لێئەدا، خۆی بە لایەنگری سوێند

---

[1]– مەبەست لە بەرپا بوونی جەنگ لێرەدا، جەنگی یەکەمی جیهانیە.

خۆران ئەدایە پێنووس.

بەڵام لەژێرەوە کە چنگی لە بەرۆکی قەیسەر گیر ئەبوو، زمانی لە بەخت ڕەشی ڕوسیا ئەگێڕا بەوەی دووچاری جەنگ بووە لەگەڵ ئەڵمانیا، نیشتمانی گیانی و ڕۆشنبیری شابانو... ئەمە لەکاتێك دا لەلای شابانو نوقڵانەی دواڕۆژی لێ ئەدا و ئەی وت:

- ئەی ئەلکسەندرا هەرگیز خوا گەلێکی دواکەوتووی جوتیاری نەخوێندەوار سەرناخا بەسەر ئەڵمانا کە گەلێك بەشان و شکۆترن، ئەگەر خوا نەخواستە ئەمەش ڕووی دا ئەوە کارەساتێکی لەناوبەری ئەوتۆ ڕووئەدا لە ڕوسیا ئەگێڕێتەوە سەر دڕندەیەتی پێشینیان و پەشێوی هەموو گۆشەیەکی جیهان ئەگرێتەوە...

شابانو بەگەرمی و بەدڵ سوپاسی بێ پایانی ئەم قسە شیرینانەی ڕاسپۆتینی ئەکرد، وەبە پەرۆشەوە دەستەکانی ماچ ئەکرد، شابانو گەیشتبووە ڕادەیەك لە کانی دڵەوە ڕقی لە گەل ڕوسی ئەبووەوە کە وا ئێستا بۆتە قەڕاڵیچەیان و لەسەر تەختی شایەتیان دانیشتووە، بەدڵ حەزی ئەکرد ڕوسیا توشی شکست بێ و سەرانسەری وڵاتی ڕووس لەژێر سمی وڵاغی سوارە (تیۆتۆن)ە دڵ ڕەقە داگیرکەرەکانا بپلیشێتەوە، کە ئەمانە بە بەرەمامی شابانو ئەژمێرێن.

ئەوەی فێنکی بە گیانی قەڕاڵیچە ئەگەیان ئەوەبوو کە بەشێك لە دانیشتوانی فنلەندە -کە ئەو کاتە بە هەرێمێکی ڕوسیا دا ئەنرا- دەست بەرداری بەرزکردنەوەی ئاڵای ڕوسیا بوون، وە بە هاوبەشی لەگەڵ لەشکری ئەڵمانیادا هاتبوون لە ڕووی سوپای ڕوسیا ئەجەنگان.

قەڕاڵیچە ئەوەندە شپرزە و دەماراوی بوو چاوی بە کەسێك هەڵنەئەهات ئەگەر لە لایەنگرانی تەواوی ئەڵمانیا نەبووایە، چونکە لەو باوەڕەدا بوو کە چارەنوسی بەستراوەتەوە بە چارەنوسی مەسەلەی سەرکەوتنی

ئەڵمانیاوە ئا لەم جەنگەدا کە بەرپا بووە، بەوەی سەرکەوتنی غلیۆمی دووەم لەوانەیە تەختی حوکمڕانی قەیسەری لە ڕوسیادا قایمتر بکا وە بەزینی ئەڵمانیا ببێتە هۆی لابردنی ڕژێمە کۆنە پەرستەکانی ئەورووپا.

لە ڕاستیشا بیروباوەڕی لەم لایەنەوە ڕاست و دروست بوو، راسپۆتینیش کە خاوەن زیرەکیەکی خروسکی بوو بەگورجی ئەم بیروباوەڕەی ئەوی گرتە ئەستۆ، بەوەی ئەیزانی کە داوێن پیسێکی وەك خۆی کە نمونەی ناپاکی و بەربەرەڵاکردن بوو هەرگیز ناژی و هەناسە نادا لە ڕژێمێکی بۆگەن و ستەمگەری دا نەبێ، چونکە لە شوێنێك دا کە ئازادی هەبێ ئەم جۆرە کەسانە ناژین.

بەوەی ئەڵمانیا دەستێکی باڵای هەبوو لە سیخوری دا (جاسوسی) بگورجی بەکرێ گیراوەکانی ئەڵمانیا خۆیان گەیاندە لای، بەوەی پێشەکی بیروباوەڕی شاراوەی راسپۆتینیان دۆزیەوە، کەوتنە کنە لەگەڵیا بەنیازی ڕاکێشانی بەلای خۆیانا، بۆ کەڵك وەرگرتن لە تواناو دەسەڵاتی بێ سنوری لە کۆشکی قەیسەریدا.

ئەڵمانەکان پەشیمان نەبوون لە گرێدانی پەیوەندیان لەگەڵیا بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، بەوەی راسپۆتین سودی گەورەی پێ ئەگەیاندن، چونکە ئاگادار بوو لە هەموو ڕوداوەکانی ناو کۆشکی قەیسەری زۆر بە وردی و خێرایی، بەجۆرێ کە قەیسەر خۆی ئەوەندە بە وردی کاروباری ناو کۆشکی نە ئەزانی.

راسپۆتین بە گاڵتەیەکەوە بە شابانوی وت:

– نیقی خۆی لە بەڵای جەنگەوە گلاندووە لە ڕیزی فەرەنسیەکانا، ئەم تێوەگلاندنەی لە بێ مێشکیەوە هاتووە، لە ئەنجامیشا سەری خۆی و ئێمە بەسەر یەکەوە بە فەتارەت ئەدا.

هەروەها راسپۆتین هەموو توانای خستبووە کار بۆ تەگەرە دروست

کردن له ڕێگای سیاسەتی قەیسەرا وە بۆ هەرەس پێهێنانی وتووێژەکانی سەرکەوتن لە کۆڕی شەڕا بەوەی لەبەردەم قەیسەر و دەست و پێوەندەکانیا ئەوپەڕی دڵسۆزی بۆ ڕوسیا ئەنواند لەدژی ئەڵمانیا، لە هەمان کات دا تێئەکۆشا بۆ دامەزراندنی لایەنگرەکانی لە پلەو پایە بەرزەکان دا بەتایبەتی، لەناو سوپادا، لەسایەی سەری ئەوەوە هەموویان لە ناپاك و بەرتیل خۆرەکان بوون بەتایبەتی ئەوانەی کە پەیوەندی ناپاکیان لەتەك ئەڵمانیادا هەبوو، واتە ئەوانەی موچەی سیخوڕیان بە ڕێك و پێکی وەرئەگرت لە گەرمەی جەنگ و لە ڕۆژانی ئاشتیشا بەرامبەر بەو خزمەتانەی بە فەرمان ئەدرا بەسەر شانیانا کە ئەبوایە جێبەجێ ی بکەن.

ئەگەرچی نە توانرا بوو هەموو جێگە گرنگەکانی بدرێ بەوانەی لە نەژادی ئەڵمانن یا ئەوانەی ئەڵمانیان خۆش ئەوێ لەبارەی زرنگاری (سیاسەت) و ڕۆشنبیریانەوە.

راسپۆتین بە هەموو توانای لەڕادەبەدەریەوە، توانی لە گەرمەی جەنگدا ئەو ناپاکە (شتۆمەر) دامەزرێنێ لە پایەی سەرۆك وەزیرانا، ئەم خۆفرۆشە لە نزیکترین هاوڕێکانی بوو کە لەهەمان کات دا بەکرێگیراوێکی ئەڵمان بوو، وەزارەتی ناوخۆ -کە هێلانەی تابوری پێنجەم بوو- بۆ برادەرێکی تری پچڕی بوو، ئەویش ناپاکی گەورە (برۆتۆبۆبۆف) بوو هەروەکو چۆن وەزارەتی جەنگیش بۆ (بیڤی) گەورە ژەنڕاڵ (سۆفۆفیلۆف) داگیرکرد بوو.

کە ئەم سێ کوچکەیە بۆ راسپۆتین سەری گرت، کە ئەم پایانە لە بەرزی دا هیچ پایەیەکی تری میری نایانگاتێ، دڵی ئاوی خواردەوە، بەوەی ئیتر نهێنیەکانی نایەتە درکاندن، وە هەتا دەربازبوونی ڕوسیا لە شکستی و لە کارەساتی سەربازی دا لەوانەیە موعجیزەی ئاسمانیش بەکەڵکی نەیەت...

جگە لەمانە ئەڵمانیا لەناو فەرمانە گەورەکانی ناو کۆشکی قەیسەری دا

گەلێ پیاوی دڵسۆزی هەبوو کە بەکرێگیراو نەبوون، وەك بەڕێوبەری کۆشك (باڕۆن فریدریکس) کە بەلایەوە شورەیی بوو لەزمانی ئەڵمانی بەولاوە زمانێکی تر بەکاربێنێ بۆ گفتوگۆ ئەگەرچی ئەمە دەمێك بوو جەنگیش بەرپابوو بوو.

هەروەها ڕاوێژکەر (ینکردۆرف) و وەزیری زانیاری گشتی (شفابناخ) کە بەناوبانگ بوو بە ڕاپۆرت دانی هەفتانەی بۆ (بەرلین) بەڕێك و پێکی.

هەروەها (مکلنبۆرك ستریلتز) کە جنسیەیەی ڕووسی دەست کەوتبوو بەر لە داگیرسانی جەنگ بە ماوەیەکی زۆر کورت، دوور نیە هەر لەبەرئەم مەبەستە وای کردبێ چونکە پێشەکی زانیویە شەڕ هەڵئەگیرسێ، بەڵام لەکانی دڵەوە هەر ئەڵمان بوو.

جێگای سەرسوڕمانە کە چۆن ئەم ژمارە گەورەیە لە لایەنگرانی ئەڵمانیا، هیچ گومانی دەوڵەتە سوێند خۆرەکانی نەوروژان، ئەمەش ئەو ڕاستی یە ڕوون ئەکاتەوە کە سوێندخۆران ئاگاداری کاروباری کۆشکی سوێندخۆرە ڕۆژهەلاتیەکەیان نەبوون.

ڕۆژنامەکان سەربەست نەبوون لەبەرئەوە پڕ بوون لە هەڵمەت بردنە سەر ئەڵمانیا هەتا ئەو ڕۆژنامانەی بە زمانی فرنسیش دەرئەچوون، بێگانەکان دەسیتیان بەسەرا گرتبوون بەهۆی ئەوانەی نۆکەر و ئەڵقە لەگوێی ئەڵمان بوون، کاتێ کە شابانو ئەو هێرش و هەڵمەتانەی ناو ڕۆژنامەکانی ئەخوێندەوە، سارد ئەبووەوە و ورەی بەرئەدا، بەڵام راسپۆتین بە گاڵتەوە ئەیدایە قاقای پێکەنین و ئەی وت:

– ئایا گەوجێتی خەڵکی گەیشتۆتە ئەو ڕادەیەی کە وا باوەڕ بکەن کە بەسبەر ئەڵمان دا زاڵ ئەبین؟!..

ئا ئەمە بوو حاڵ و ئەحواڵی لەناو کۆشکی قەراڵی ڕوسیا... بەڵام لە ڕیزەکانی گەلا ئەوەی ورتەی لەدەم دەرچووایە بەوەی سەرکەوتن بۆ

ئەڵمانیا ئەبێ، بەگورجی ڕاپێچ ئەکرا و ئەخرایە بەندیخانەوە، یا خۆڕایی تاوانبار ئەکرا بە سیخوڕی بۆ ئەڵمان و ئەکرا بە ناپاك و بەکرێگیراو ئەم لەکانە بەهەر کەسێکەوە بنوسایە ئیتر پاکانە دادی نەدەخوارد بەگورجی دادگا مۆری ناپاکی و گیانی ورەبەردان بە خەڵکی ئەنا پیایا.

بەڵام دەستە ناپاکەکان لە پیاوانی کۆشك، بۆ ڕابواردن بەوپەڕی دڵنیاییەوە ئەچوون بۆ سەیری هێزی چەکدار ئەو کاتانەی لە سەربازخانەکانەوە ئەنێران بۆ کوڕی جەنگ.

سەربازە ساویلکەکان بە باوەڕی تەواویانەوە سرودی سڵاو پێشکەشکردنیان بۆ قەیسەر ئەخوێند کە بە بەردەمی کۆشکی زستانەدا تێ ئەپەڕین، لەگەڵ نەعرەتە کێشانیانابەم جۆرانەی خوارەوە:

– ئەمرین هەتا ڕوسیا بژی ... ئەمرین لەپێناوی خواو قەیسەر و ڕوسیای پیرۆزا ... تێکۆشانمان هەتا مردنە!

ڕاسپۆتین بە ساویلکەیی ئەم قۆچی قوربانیانە پێئەکەنی کە بۆ سەربڕین ئەبران بۆ کوڕی قەسابخانەی جەنگ کە ناپاکەکان و خوێن مژەکان سازیان کردووە بۆ سەرۆکایەتی خۆی.

لە کوڕی جەنگێکا کە سەربازەکان لە هەموو شتێکیان کەمە لە پێڵاو و سابونەوە بیگرە هەتا ئەگاتە ئازووخە و باڕووت..

لەڕاستی دا ئەگەر ژەنراڵ برۆسیلۆف –سوپا سالاری گشتی تەواوی سوپای ڕوسی بوایە، ئەم ژەنراڵە کە ڕادەی بلیمەتی لە ناپلیۆن کەمتر نەبوو ئەگەر بەرەو ژوورتر نەبووایە، هەتا ئەمیش هەرگیز لەتوانایا نەدەبوو سەرکەوتن مسۆگەر بکا بە سوپایەکەوە ئەمە حاڵ و ئەحواڵی بێ..

ناپاکان و ناپاکی لەچوار لاوە سوپا و وڵاتی ئابڵوقەدابوو، لەکوڕی شەڕەکان و لەپاشەڵی سوپاوە، لە بارەگاکان و لەناو کۆشکی قەیسەریا

بەشێوەیەکی ڕێك و پێك.

هۆی درێژە کێشانی شەڕی ڕوسی بۆ دوو ساڵی ڕەبەق ئەگەڕێتەوە بۆ سەر ئەم هەمە چیزە ناپاکانە، کە بەسەدان هەزار گەنبیان بە خوت و خۆڕایی دا بە گورگان خواردوو، باری نالەباری سوپا بە دەردی چوو بوو هەرگیز نەیئەتوانی خۆی بگرێتەوە، ئیتر بەربەرەڵا بوو کە بزوتنەوەی شۆڕشگێڕی پەرەبسێنێ بەبێ کەند و کۆسپ.

## با ڕۆما بسوتێ

دەستەی لاوان بەگەرمی ڕوویان ئەکردە کوڕی جەنگ، خۆشەویستی نیشتمان ئاگری کردبووەوە لە دڵ و دەروونیانا، خۆشەویستی قەیسەر و ڕوسیای پیرۆز، هەتا چینی بەرزی ڕوس لە چین و توێژەکانی تری میللەت کەمتر نەبوون لە ڕووی بەخشندەیی و قوربانی دا ئەوە بوو ئەوانیش خوێنی خۆیان بە هەرزان ئەدا لەپێناوی پاراستنی سەربەستی نیشتمان و پاراستنی لە دەست درێژی دوژمن.

درێغ کە چینی بەرز لە ڕاستیا هەموو چوونیەك نەبوون، هێندێکیان کە لە نەژادا لە خانەوادەکان بوون زۆر بەخشندەو ئامادەبوون بۆ خۆبەخت کردن، هەر کاتێ پێویستی هاتە کایەوە، بەڵام هێندێکی تریان کە خۆیان بەم چینەدا شۆڕکردبووەوە، نەك هەر لەبەرئەوەی لەوانن یا هاوبیریانن، نەخێر لەبەر ئەمانە نەبوو، بەڵکو بەهیوای قۆستنەوەی دەرفەت بۆ سامان کۆکردنەوە، شاری مۆسکۆ و پترس بورگ جمەیان ئەهات بەم جانەوەرانەی کە خۆیان لەم چینە هەڵئەسوو، سنگ بردنە پێشەوەیان لەڕووی سامان و دارایییەکەیانەوە بوو، لە ژیان و ڕابواردن و لەوەڕان بەولاوە هیچی تر لە دوو توێی مێشکیانا جێی نەبوو بووەوە. لەبەرئەوە هیچ سەرمایەیەکی تریان نەبوو ای‌ی بترسن وەك شەرەف یا نەریت و

ڕەوشتی پیاوانەی پێشینان، کە ببێتە هاندەریان بۆ ڕاوەستانیان لەڕووی دەست درێژی ناڕەوادا، بۆیە ئەم چینە لەلایەکەوە کوشندەی کۆمەڵ بوون، چونکە نرخ و بایەخ و قەدریان لەناو هەژار و داماوانا نەمابوو، هەروەك چۆن پەیڕەوی باری ڕەوشت بەرزی (درۆزنانەی) خانەدانی خۆشیان نەدەکرد.

ئایا ئەمانە یارمەتیەکیان پێشکەش کرد لەو جەنگە ڕەشەدا کە وەك ئاش بە بەرداش لەش و ژیانی هەزاران هەزاری ورد و خاش ئەکرد، ئەمانە بۆ بەرزکردنەوەی گیانی مەعنەوی کەوتبوونە سەر گێڕانی زەماوەندی گەرم گەرم، بە نەزمێکی پڕ لە خواردن و خواردنەوە، ئەگەر کەسێ بێز و قێزی خۆی لەو ڕەوشتە چەوتانەیان بهێنایەتەوە، بەگورجی گیانی نیشتمان پەروەری ئەو بەسەزمانەیان لەکەدار ئەکرد و ئەکرا بە ترسنۆك و بەکرێگیراوی دوژمن!

لەکاتێك دا بەسەدان ژن و کچۆلە ڕوویان ئەکردە کڵێسەکانیان بۆ فرمێسك هەڵڕشتن بۆ شەهیدەکانیان لە جلوبەرگی ئاودامان ڕەشیانا، بۆ ئەو کوڕ و مێرد و برایانەیان کە لە ژیانیانا کۆڵەکەی ڕاگرتنی خێزانیان بوون.

لەکاتێك دا گەلی هەژار ئەینالاَن لەژێر باری برسێتی و نەبوونیانا، بەوەی نانی ڕەق و وشکیان چنگ نەئەکەوت کە بیخۆن، ئەمە لەکاتێکا پوختە و پالاَوتەی چین و توێژەکانی کۆمەڵ بەرەو کوشتاری سەر سنوور ئەڕۆیشتن، ئا ئەم بۆگەنانە لە دەوڵەمەندی تازە پیاکەوتوو لە گازینۆ و چایخانە و چێشتخانە و تیاترۆخانەکانا جێگایان بۆ کەس نە ئەهێشتەوە هەموویان پڕ ئەکردەوە بە دانیشتن بۆ لەوەڕان و ڕابواردن و بە زەماوەند و بەزمی ژوورە تاریکەکانی تیاترۆخانەکان، هەموو سەرمایەیان بۆ لاف و گەزافی نیشتمان پەروەرییان، بەتاڵ کردنی شوشە شەمپانیاکان بوو، لە بەختی تەندروستی ڕوسیا و سوپای قەیسەری پایە بڵند کە پەیتا پەیتا فڕیان ئەکرد!

ئایا ئەمانە ئەبێ بۆخۆیان بڕەنجێنن؟ وە یا بۆ ئێمە ئەم هەموو

سەرزەنیشتیەیان بکەین؟ ئەمە لەکاتێکا پێشەنگی ئەم دەستانە پیاوانی لەوان پایە بەرزترن لە کاروباری دەوڵەتیا، ئا ئەوە سەرۆك وەزیران (شتۆمەر) کە هێشتا دڵی بۆ نەژادی نەمساوی خۆی لێ ئەدا، وە درێغی نەکردووە و ناکا لە پێشخزمەتی بۆ ئەڵمانیەکان کە لەتەك نەمسەدا بە گژ ڕوسیادا چووە. ئا ئەوەش وەزیری جەنگ ژەنراڵ (سۆخەلینۆف) کە بە دزی و تالان هاتۆتە وێزەی دارایی هێزی چەکدار و ئازوخەکەی، ئەمەشیان وەزیری دەوڵەت (زتسفێتش) کە بەدزی و ئاشکرا تالانی سەرو پۆتەلاکی بودجەی تەموین و باربۆ و یارمەتی دانی هەژاران ئەکا، ئەمیش وەزیری ناوخۆ (برۆتۆبۆبۆف) کە خۆی پف داوە بە ڕاست و چەپا پارە و دراو خەرج ئەکا لەو پارە زێڕانەی کە بە بەرتیل دەسی ئەکەوێ، یا بە ڕێگەیەکی لە بەرتیل خراپتر ئەویش ڕێگەی خزمەت گوزاری دوژمن، ڕێگەی سیخوڕی.

هاوبەشی گەورە بۆ ئەو بەرتیلانەی وەزیری ناوخۆ وەری ئەگرت، لالە راسپۆتین بوو کە ئێستا بەرگی قەشەیەتی فڕێ ئەدا و بەرگی پاك و تەمیز لەبەرئەکا، هەتا بەئاسانی تێکەڵ بێ بە هاتوچۆکەرانی (کەباریەکان) و شوێن سەماکردنەکان، هەتا سەرنجی کەس بۆخۆی ڕانەکێشێ و هەرا نەکەوێتەوە.

ئەوترا کە ئەچوو بۆ ئەو گەرماوانەی کە ئابڕووی تیا پایە ماڵ ئەکرا، بێگومان ئەمە درۆیە چونکە راسپۆتین نەدەچووە گەرماوەکان ئەگەر ژوانی نەبووایە لەگەڵ دۆستێك لە دۆستەکانی یا (ژنێك لە ژنە گیانی)یەکانی لەوانەی ناوێرێت ڕوو بکاتە ماڵەکانیان.. چونکە گەرماوەکانی ڕوسیا شوێنی سەربەخۆ بوون وەك گەرماوە تورکیەکانی ڕۆژهەلات کە بە سوکی دەنگیان داوەتەوە و ناویان زڕاوە، کە بۆ خۆشتن بەکار نەئەهێنران، بەڵکو بەتایبەتی بۆ لەش فرۆشتن و داوێن پیسی تەرخان کرابوون.

لەبەرئەوە سوورین لەسەر ئەوەی کە راسپۆتین هەر وەك جاری جارانی دوورە لە چوونە گەرماو بەنیازی خۆشتن، ئەو گۆڕانەی کە بەسەریا هاتبێ

هەر ئەوەیە کە ئێستا کراسێکی ئاوریشمی ڕەنگ کاڵ لەبەر ئەکا لەگەڵ دوولنگەیەکی شینی ورشەدارا، هەروەها جوتێ پێڵاویش لەپێ ئەکا لە چەرمی گرانبەهای بریقەدار دروست کراوە.

وا لە مێشکیا جێگیر بوو بوو کە ئا بەم بەرگە تازەیەوە پتر ئەو ژنانە ئەوروژێنێ و ڕایان ئەکێشێ کە هاتوچۆی ئەو شوێنە پێشکەوتووانە ئەکەن، کە لەش و لاری وەك لاولاویان بێگومان خۆشی ئەدەن بە هەست،کە ئەچووە ئەو شوێن و چێشتخانانە هەمیشە زەردەخەنەیەکی یان لا لغاوەی دەمی ئەگەیانە بنا گوێی، قۆڵی ئەکرد بە قۆڵی قسەڕەوای سەرانسەری هەموو وڵاتی ڕوسیا و حاکمی عورفی گشتی و وەزیری ناوخۆ (برۆتۆبۆبۆف) نۆکەر و هاوبەشی دزی و بیژێتی.

کە (برۆتۆبۆبۆف) سەرخۆش ئەبوو دەستی ئەکرد بە وڕێنە و چەنجەی بۆ ئەو سەربازانە درێژ ئەکرد کە مێردی ئەو ژنانەن کە بە جووتە هاتوونەتە وێزەیان ئابڕوویان پایە ماڵ ئەکەن بە منجە منجەوە ئەی وت:

– ئەبێ چی بڵێن کە گەڕانەوە؟

ڕاسپۆتین بەخۆشی و تیتاڵێیەوە سیخورمەیەکی ئەکێشا بەسەر سنگیا و ئەی وت:

–برا گیان هیچ مەترسە هیچ کامێکیان ناگەڕێنەوە!

پاشان چەپڵەیەکی لێئەدا و داوای شوشەیەك (شەمپانیا)ی تری ئەکرد هەتا بە جووتە فڕیکەن لە بەختی ئەوانەی ئەچن و ناگەڕێنەوە!

هەمیشە ڕاسپۆتین ئەگەڕا بەدوای گۆڕینی لەوەڕگای خۆشی و ڕابواردنیا، کە لە لەوەڕگای چلێسی و پەڕینی پترس بورگ بێزار ئەبوو، ڕووی ئەکردە لەوەڕگای چلێسی لە مۆسکۆ، بەوەی دوورکەوتنەوەی مێرد و باوك و برای ئافرەتان هەلی ڕاوکردن و لەوەڕانی بۆ سوك و ئاسانتر ئەکردن... نەك هەر لەبەرئەوەی کە کەس نیە لێی بترسن و بەس بەڵکو دوورکەوتنەوەی پیاوەکان لە ژنەکانیان، ئافرەتەکانی دەماراوی و توڕە و تڕۆ ئەکرد، کە بەمە

زووتـر ئەکەوتنـە ژێـر هێـزی کاریگـەری شـاراوەیەوە بـەهۆی حـاڵ وئـەحواڵی جەنگەوە کە هەواڵەکانی مێشك ئەشـلەقێنێ و بەربـەرەکانی و خۆبەدەستەوە نەدانی ئافرەتان لاواز و بێ هێز ئەکا.

بەڵام ئەم جانەوەرە دڕندەیە پلەی خۆشی و کامـەرانی هـەتا ئـەهات بـەرزتر ئەبووەوە کە هەستی ئەکرد مێردی نێچیرەکەی لەسـەر کوشتارە یا برینـدارە لەسەرە مـەرگ و گیانەڵادایە، ئا لـەو هەناسـەیەدا کە نێچیرەکەی بە دەسـتی خۆی فڕێ ئەداتە باوەشی‌یەوە.

راسـپۆتین وای لێهـاتبوو هێنـدە پەرۆشـی داپۆشـینی هـەواڵی ڕابـواردن و ڕاوکردنە تازەکانی نەبوو کە هەر ڕۆژە نێچیرێکی نوێی کەمەندکێش ئەکرد، ئـەوەبوو پێشـان بـەخواناس و داوێـن پـاك نـاوی دەرکردبـوو، بـەڵام ئێسـتا دەربەست بە داپۆشین نیە، بەڵکۆ خۆی قسـەی لێئـەکا و بڵاوی ئەکاتـەوە بۆ پڕوپاگەندە لەڕووی لەخۆبایی بوون و غوباب‌ی‌یەوە.

ئەم ڕێگە تازەیەی خستی یە ناو کەندێکی گەورەوە، لەناو خەڵکدا دەنگی دایەوە کەوا نازدارێك کە ژنی ئەفسـەرێکی گەنجە لە هێزی سـوارەدا، ئـەو ژنـە بەناوبانگ بـوو بەوەی زۆر مێردەکـەی خۆی خـۆش ئەوێ، لەهـەمان کاتیشـا بەناوبانگ بوو بە داوێن پاك، بەڵام دوورو نزیك بەوەیان زانـی کـە راسپۆتین ڕاوی کـردووە هـەموو ڕۆژێـك کاتـژمێرێکی تـەواو لەگـەڵیا ڕائـەبوێرێ، ئـەم هەواڵـە بـەرگوێی مێردەکـەی کەوتـەوە، بـە کوتـوپڕی لـە کـۆڕی جـەنگا گەڕایـەوە، لـە تووڕەبوونـا ئـەکوڵا، خـواو ڕاسـتان کـردی لـوتی بـوو بـە لـوتی راسـپۆتینەوە لـەماڵەکـەی خۆیانـا، لاوە ئەفسـەرەکە هەڵمـەتی بـردە سـەر راسپۆتین بـە چـەقۆیەکی دوو دەمـەوە لـەو کاتـەدا کـە راسـپۆتین پەلـەقاژی سواربوونی گالیسکەکەیی ئەکرد.

سـەیر ئەوەیـە راسـپۆتین هـیچ نەشـڵەژا و تێـك نەچـوو، لـە بریتـی خـۆ شڵەژاندن چاوەکانی بڕی‌یە چاوی دوژمنەکـەی و بۆ چەند هەناسـەیەك بە هێـزی موگناتیسـی چـاوەکانی ئەفسـەرەی دەم و دەسـت خـەو لێخسـت

بەجۆرێك توانای تیانەما دەستە بە چەقۆکەی بەرزکاتەوە، لەشی نیشتە سەر ئەرەق دەردان و چاوەکانی نیشتنە سەریەك.

لێرەدا راسپۆتین کێشای بە دەستیا چەقۆکەی لەدەست بەربووەوە، راسپۆتین شەقێکی لە چەقۆکە هەڵدا و پاشان سواری گالیسکەکەی بوو، سوك و باریك وەك بەرزەکی بانان بۆی دەرچوو.

بەگورجی ئەم موعجیزە تازەیەی لەناو خەڵکا بڵاوبووەوە، وای لێهات کە خاوەن ژنەکان ئەبێ خۆیان لە راسپۆتین لادەن، ئەمە لەکاتێکا ژنان بە گەرمتر لە جاران دەورو خولی ئەم ناپاکەیان ئەدا، کەس پێی نەئەوێرا بەوەی توانایەکی لە ڕادەبەدەری هەبوو، ئیتر پتر ماوەی بۆ چۆڵ بوو بە ئارەزووی دڵی خۆی ئابڕووی خەڵکی پایە ماڵ بکا بەبێ لێپرسینەوە!

ئیتر کەس نەیئەوێرا شان بدا لە شانی ئەم نەگریسە، هەتا وای لێهات پەردەی لەسەر دەست درێژی بۆ سەر ئافرەتان لەخۆی دامالی، توانای گەیشتبووە ئەو ڕادەیەی لەوە بچێ کە مافێکی باوەڕ پێکراوە لە هەموو خەڵکی مۆسکۆوە...

هەتا وای لێهات کە راسپۆتین خۆشی بێتە سەر ئەو باوەڕە کە ئەم مافە شتێکی ڕەوایە بۆ شان و شەوکەتی خۆی، بۆیە بەشتێکی سروشتی ئەهاتە بەرچاو، بەجۆرێ هەتا حاشا کردن و خۆ لێڵ کردنی بەتاوان و هەڵە دائەنا، بە وێنەی خەو لێخەر لایەلایەی خەو بۆخۆی بکا یا هەڵ خەڵەتێنەر بێ و خۆی لە خشتە بەرێت.

حەسیر مەیدان

لەگەڵ ئەم بازاڕ شێواویەشا دیسان ڕوسیا بەتاڵ نەبوو لە پیاوێکی وا بوێرێ شان بدا لە شانی راسپۆتین و لەڕووی دەسەڵاتیا بوەستێ، ئەمەش گراندۆق (نیکۆلا نیکۆلافیتش) بوو کە هەموو توانای خۆی خستبووە کار بۆ ڕزگارکردنی وڵات لەم نەخۆشی تیراویەیە کە خەریك بوو تەشەنەی ئەکرد، لە هەموو سوچ و قوژبنێکا و خەریك بوو کۆمەڵ بەرەو هەرەس بردن بەرێ.

گراندۆق لەم کاتەدا لەتەك لیژنەی ئەرکانی جەنگی سوپادابوو، گورج و گۆڵی پیاوانەی جێگای ڕێز لێگرتنی هەموو دڵسۆزان بوو، دەستێکی باڵای هەبوو لە لە ڕزگارکردنی سوپا لە گەڵ دژوار و تەنگ و چەڵەمەی پر مەترسی دا، بۆیە سیخوڕەکانی ئەڵمان بەچاکیان زانی سنورێك بۆ وریایی و گورج و گۆڵی ئەو پیاوە دابنێن، بڕیاریان دا ڕاسپۆتین بنێرن بۆلای بەڵکو بتوانێ ئەم تەلیسمە بشکێنێ.

سەر لە بەیانیەکیان سەرۆك سیخوڕەکانی ئەڵمان لە پترس بورگ خۆی گەیاندە بارەگای (پیاوی پیرۆز) لە شەقامی (جۆرۆکۆفیا) لەدوای چاك و چۆنی لە یەکتر کردن یەکەن دەردوو بەبێ پێشەکی بە ڕاسپۆتینی وت:

– وا ئەزانم چاکەیەکی گەورە ئەکەی، ئەگەر خۆت بگەیەنیتە بارەگای سەرکردایەتی جەنگ لە کۆڕی شەڕا...

– مەبەست لە چوونم چییە و سەبارەت بەچی یە ئەم چوونەم؟

– هەتا ژەنراڵ (نیکۆلا نیکۆلافیتش) بخەیتە سەر ڕێگای قایل بوون بە گرێدانی ئاشتی دوو قۆڵی لەنێوان ڕوسیا و ئەڵمانیادا.

– ئایا ئەمە پێویستە؟ وە لەو باوەڕەدای کە ئاشتی دوو قۆڵی کارو کردەوەیەکی پەسەندە؟

گەورەی سیخوڕەکانی ئەڵمان لە نیاز و مەبەستی قەشەی نەگریس تێگەیشت، بۆیە کێشای بەسەر شانیا، پاشان چەکێکی پارەی بە پارەیەکی یەجگار زۆر خستە ناو قولی مشتیەوە. ئەم بەڵگەیە کاری خۆی کرد لەدڵ و دەروونی (پیاوی پیرۆز) بۆیە بڕیاری دا کە یەکەندەردوو بکەوێتە خۆی وە هەر بەو شەوە خۆی بگەیێنێتە بارەگای سەرکردایەتی جەنگ.

دیارە ڕاسپۆتین هەموو کەرەسە و پێویستی‌یەکی تەواوی ڕێگەی پێ بوو، هەتا هیچ کەسێك نەتوانێ قەدەغەی ڕێگای لێبکا بۆ گەڕان بە ناوچە قەدەغە کراوەکانی کۆڕی جەنگ دا ڕاسپۆتین بەبێ ماندوو بوون گەیشتە بارەگای سەرکدە گراندۆق نیکۆلا بەوپەڕی ڕێزلێگرتنەوە، کە گەیشتە لای

گراندۆق بە ڕوویەکی خۆش و گەشەوە چاك و چۆنی لەگەڵدا کرد و پاش دانیشتن راسپۆتین کەوتە دەست هەڵ گلۆفتن و پێ ی وت:

– هاتووم پێت ڕابگەیەنم کە مەریەم هاتۆتە خەوم سێ ڕۆژ لەمەوبەر!

لە وەڵاما گراندۆق خۆی سەراسیمە کردوو وتی:

– ئەرێ بەڕاستە؟ ئەمە شتێکی گرنگە! بێگومان!

– کەوا بوو گوێم لێبگرە هەتا بزانی چی پیا ڕاگەیاندووم، مەریەم ڕای سپاردووم:

بڕۆ بە ژەنراڵ (گراندۆق نیکۆلا) بڵێ کە ئەمەوێ تێکەوێ بە قایل کردنی قەراڵی کورە مامی بۆ هەڵسان بە ئەرکی پێکهێنانی بەستن و گرێدانی پەیمانێکی ئاشتی دوو قۆڵی لەگەڵ غلیۆم بە زووترین کات!

هاوارێکی سەرسامی لە گراندۆق نیکۆلاوە بەرزبووەوە:

– بەخوا سەیرە! ئەمە پیاو سەراسیمە ئەکا!

پاشان ئەمە خۆی خستە بارێکی ترەوە بەوەی خۆی لە راسپۆتین نزیك خستەوە و چرپانی بە گوێیا و پێ ی وت:

–منیش نهێنیەکی گرنگم هەیە ئەمەوێ پێتی بڵێم: وەك وتان ئێوە (مەریەمی عەزراتان) پێش سێ رۆ ژ دیوە، ئایا ئەمە وا نیيە؟

– بەڵێ بەر لەسێ ڕۆژ...

– سەیر ئەوەیە کە مەریەمی عەزرا هاتۆتە خەوی منیش، بەڵام دوێنێ شەو، ئایا ئەزانی چی پێ وتووم؟

قەشە داچڵەکی و بەسەر سوڕمانەوە وتی:

– نەخێر .... نازانم.

– ئەوە پێ ی وتووم هەرگیز بە بیری هیچ کەسێکا نایەت لەبەر سەیری..

– ئەرێ ئەبێ چی بێ؟

– دەسا هانێ ئەوەی مەریەمی عەزرا دوێنێ شەو پێ ی وتووم:

مەریەم وتی باش گوێم لێ بگرە ئەی نیکۆلا نیکۆلافیتش، من مەریەمم، من

قسەت لەگەڵ ئەکەم، باش گوێم بۆ شل کە، پاش ئەمە وتی: بەیانی ئەو دەست بڕە زۆڵە راسپۆتین خۆی ئەگەێنێتە لای تۆ، ئەو نەگریسەی کە زمان لە ڕەهبەنی ئەدا، کە ڕەهبەنی دوورە لەو، وا پێت ئەڵێم کە گەیشتە لات حەسیرمەیدانێکی باشی بکە، بەناوی منەوە، هەتا کلێنچکەی دائەپەنمێنی!

کە راسپۆتین گوێی لەم پلارانە بوو لە دەمی گراندۆق وەك گوللە دەر ئەپەڕێ وەك گا بۆڕانی:

– ئای ئەوە تۆ چی ئەڵێی؟

گراندۆق چاوەکانی بڕیە دوو چاوی راسپۆتین، بەبێ شڵەژان پێی وت:

– ئەگەر لە قسەکانم تێ نەگەیشتووی وا ناچارم قسەی مەریەمی عەزرا نەشکێنم، چی پێ وتووم بە کردەوە جێبەجێی بکەم ئەی باوکی گەورە و پیرۆزم!

پاشان گراندۆق قسەکانی خۆی کردە ڕاست و چاپوکانەوە هاتە وێزەی راسپۆتین، بەجۆرێ راسپۆتین بە پەلە پروزە لە چنگی قوتاربوو!!

لەگەڵ ئەمەشا، هەموو شتێك لەم خاڵەدا نەکوژایەوە، بەڵکو ڕۆژی ئایندە راسپۆتین خۆی گەیاندە قەیسەر، وەك کوونەبوو کەوتە قڕاندن، بەوەی کارەساتی گەورە بەسەر خانەوادەی قەیسەری و تەخت و تاراجیانا ڕووئەدا، خۆ ئەگەر پاڕانەوەو پشتگیری ئەم نەبووایە لەمێژ بوو ڕەچەڵەکیان بڕابووەوە، ئیتر لەسەر ئەم کەڵەك و کوڵکەی خۆی ڕۆیشت هەتا قەیسەری خستە سەر باوەڕکردن بەو دۆر و دەلەسانەی هەڵی ڕشت لەبەردەمیا، سوێند و پەیمانەکەی خستەوە یاد قەیسەر بەنیازی ئەوەی هەموو داخوازییەکانی بۆ بهێنێتە دی، کە لەسەروو هەموو داخوازییەکانی یەوە دوورخستەوەی گراندۆق نیکۆلا نیکۆلافیتش بوو، بەشێوەیەکی دەست بەسەری بۆ چیاکانی قەوقاس.

بەم جۆرە ئەڵمانەکان ڕازی کران بە دوورخستنەوەی گراندۆق لە بارەگای سەرکردایەتیدا، وە بەمەش راسپۆتین پارەی ئەو ناپاکییە گەورەیەی

وەرگرت و وەگ گەزۆو مازوو هەڵی لوشی!

ئـەم گراندۆقـە دڵسـۆزترین ڕاوێژکـەری سـوپایی زرنگکـاری (سیاسـی) قەیسـەر بـوو، هـەر وەك چـۆن گـەورەترین کۆسـپ بـوو لـەڕێگای گرێـدانی پەیمانی ئاشتی لە نێوان ڕوسیا و ئەڵمانیادا بە دوو قۆڵی.

## سەرکێشی

بەم ڕەنگە راسپۆتین وا خۆی هاتە پێش چاو کە یەکە پیاوی سەرانسەری ڕوسیایە، وە کەس نیە بوێرێ شان بدا لەشانی و ببێ بە کۆسپ لەڕووی ڕەوشـتی چڵێسـی تایبـەتی و ڕابواردنیـا وە لـەبارەی گەمـە بازیـیـە سیاسیـیەکانا بەم و بەو کە لەبەر زۆری لە مێشکیا جێگایان نابێتەوە..

ئەوەتا توانی کوڕە مامی قەیسەر تور هەڵدا بە دوورخستنەوە، بۆچی؟، چونکە کۆسپە لەڕێگەی سەرپێ گرتنی ئارەزووی ناپاکی ئاشکرای ئەوا، هـەر ئـەم بـاوەڕە کوێرانەیـە بـوو بـووە هـۆی خسـتنەوەی سـتەمکاری و تێکچوونی شیرازەی سنورکێشانی هەڵسەنگاندنی حاڵ و ئەحواڵی وڵات.

شـەوێ لـە شـەوان کـە لەبـەر سەرخۆشـی لای لـەموو ئـەکرد لـە یـەکێ لـە ئاهەنگە شەوییەکانا لە شوێنێك لە شوێن سەماکردنە گشتییەکانا، بە لـوت بەرزیەکەوە بە هەموو دەنگییەوە ئەی قیڕان و ئەی وت:

–لە قەیسەر بەهێزتر و دەست ڕۆیشتوو ترم لـە هـەموو سـەرێکەوە، ئەمـە شتێکی پڕ مەترسی ئەوتۆ نـەبوو کـە راسپۆتین نـەوێرێ دەری بڕێ، چـونکە ئەمە خۆی بوو بووە ڕاستییەکی ئەوتۆ هـەموو لایـەك سـەلماندبوویان، لـەوە ئەچوو کە بە شێوەیەکی ڕەسمی بڕیاری لەسـەر درابـێ، بـەڵام راسپۆتین لـەم سنوورەش تێپەڕی کردبوو، بـەڵکو بەئاشـکرا خـۆی هەڵئەکێشـا بـە ناپـاکی و گـزی لــە نیشـتمان و پـیلان نانـەوە لـەدژی، دابوویـە قاقـای پێکـەنین وەك نەخۆش ئەیبزڕکان و ئەم قسانەی هەڵ ئەڕشت:

– ئـەو گیانلەبـەرە خواناسـانە! مەبەسـتی لـە قەیسـەر و شـابانو بـوو! ئیتر

راسپۆتین بەجۆرێ شوڵی لێ هەڵکێشا بوو، بەوردی لە چۆنێتی کردەوە ناپاکی‌یەکانی خۆی ئەدوا بەجۆرێ بە ئاسانی هەموو شتێکی لەسەر ئەبووە ماڵ.

بۆیە بۆ ڕۆژی ئایندە کە سەرخۆشی بەری دا و هەڵەوەڕی دوێنێی بیرکەوتەوە، یا برادەرەکانی ئەوانەی لەگەڵیا بوون بەیادیان هێنایەوە، کە هەموویان حەپەسابوون بەوەی لەوانەیە ئەوانیش لەگەڵیا سەریان تیابچێ بەوەی هاوبەشی ئەون، هەروەها راسپۆتینیان ئاگادار کرد کە هەر قسەیەکی لەدەم دەرپەڕیوە بە تۆمارکراوی بەرزکراوەتەوە بۆ بەرزترین پایەی دەوڵەتی...

شتێکی سروشتی یە کە دەستەی گراندۆقەکان واتە ئەمیرەکانی خانەوادەی قەیسەری کە تەواو بێزار بوو بوون لێی، یەکەم لەبەر ناپاکی راسپۆتین و داوێن پیسی و دەسەڵاتی بۆگەنی بەسەر وڵات و دەوڵەتا وە دووەم هەر ئەو نەگریسەش بووبوو بەهۆی دوورخستنەوەی کوڕی مامیان گراندۆق (نیکۆلا نیکۆلافیتش) لەبەرئەوە بە وردی خستبوویانە ژێر چاودێرییەوە.

دەست کەوتنی ئەم چەنەبازی‌یەی راسپۆتین بۆ ئەوان شتێکی گرنگ و گەورە بوو کە نەئەگونجا ئەم دەرفەتە لەچنگ بدەن.

بۆیە بەیانی بەگورجی چوونە دیدەنی قەیسەر -کە کوڕە مامیانە- ئەو راپۆرتە پڕ مەترسیەیان پێشکەش کرد، داوایان لە قەراڵ کرد کە دەست و بردی بنوێنێ بەرامبەری، نیکۆلای دووەم ... دۆش داما لەبەردەم دەسەڵاتی چەسپاوی راسپۆتینا بەسەر خۆی و شابانودا ئەوەتا ئەو تاوانە ڕاست و دروستانەی بە دەیان بەڵگەی لەسەر کۆبۆتەوە، کەچی ناتوانێ هەڵوێستێکی ڕێك و ڕەوان بگرێ لە تاوانا کەوتە منجە منج و وتی:

- بەخوا ئەوەی ڕاست بێ من هەتا بەردەمی خۆم بەدی ناکەم و نازانم باوەڕ بەکێ بکەم و پشت بەکێ ببەستم، متمانەم بە هەر کەسێ کرد لێم بوو

بەماری کوشندە، ئای کە چەند مرۆڤێکی بەدبەختم.

چرچ و لۆچی چرو چاوی وای نەئەگەیان کە ئەیەوێت گورج و گۆڵیەک بنوێنێ بەڵکو بە کورە مامەکانی وت:

- سوپاسێکی بێ پایانتان ئەکەم بە دەربەست هاتنتان و گەردن کەچیتان بووم، هیچ گومانێکم بە دڵسۆزی و نیشتمان پەروەریتان نیە، ئەوەی وتتان بەگرنگی سەیری ئەکەم... بەباشی بیری لێ ئەکەمەوە، خوا یار بێ هەموو شتێك بەدڵی ئێوە ئەبێ...

پاشان دەستی کورە مامەکانی یەکە بە یەکە گوشی و بەڕێی کردن! کە سەری لە ماڵ و مناڵی‌دا هەموویان وەك بەڕوو بەڕوویا تەقینەوە، بۆیە بڕیاری دا هەتا زووە ڕووبکاتە کۆڕی جەنگ، بەر لەوەی بڕیارێك لەسەر ئەم کەین و بەین و ڕووداوە گرنگە بدا، پەلەقاژەی ئەوەی بوو پەژارەی خۆی لە زەریای ڕەشا نوقم بکا.

بودەڵەیی خۆی لەناو ماڵا داپۆشی بوو بە پچڕینی سەرکەوتن لە گەرووی بەزین و هەڵهاتنا.

لە هەمان کاتا گەورەی کەنیزەکەکان (ئانا) بەتەواوی ئەو وتووێژەی لە دیدەنی گراندۆقەکانا لەگەڵ قەیسەرا ڕووی دابوو بە راسپۆتینی ڕاگەیاند، بە ئەنجامەکەی راسپۆتین دڵ ئاسوودە بوو، بەڵام دەستەی گراندۆقەکان بەمە دا نەسەکنان، بەڵکو ئەم کارەساتە ڕووداوەیان لەناو خەڵکا بڵاوکردەوە، بەمە دوژمنە ڕق ئەستوورەکانی راسپۆتین ڕاست بوونەوە لەگەڵ دوژمنە تایبەتیەکانیان کە بریتی بوون لەو خاوەن ژنانەی بە ئاشکرا دەست درێژی کردبووە سەر ئابڕووی ژنەکانیان، بڕیاری پشتگیری ئەو هەڵمەتەیان دا کە ئەکرێ بۆ سەر راسپۆتین، بەنیازی لەناوبردنی هەتا ئەگەر بە کوشتنیش بێ لە چەقی ڕێگەدا.

راسپۆتین هەستی بەم بزوتنەوەیە کرد کە لەدژی ساز ئەکرێ، وای بەچاك زانی بۆ ماوەیەك خۆی بشارێتەوە و لەبەرچاو نەمێنێ، بەوە دڵی خۆی

ئەدایەوە کە گەلی ڕوس نوزە دریژنین و بەگورجی کارەساتی وا گەورە تووڕ ئەداتەلاوە، هەر بەوەی لێیان گەڕێ هەتا گەرداو دائەمرکێتەوە.

کە راسپۆتین ئەم بڕیارەی دا، چوو دیدەنی لە شابانو کرد و پێی وت:

– وا ئێستا بەجێت ئەهێلم و ئەگەڕێمەوە سەر گۆشەگیری خۆم لە دێرەکەما لە سیبیریا، چونکە دەست بەردارم بووی، وەك نێچیر فرێت دامە بەردەمی دوژمنەکانم، وە نەتوێرا لە ڕوویانا ڕاوەستی و بەربەرەکانێیان بکەی، وە سنورێك بۆ ئەو درۆو دەلەسانەیان دابنێیت کە بە خوت و خۆڕایی لەکەداریان کردم، دە بخۆ دەی با ئیتر خۆت و کوڕەکەت هەر تلاوتلتان بێ، لەمەولا خۆم ماندوو ناکەمبۆ خزمەتتان، لە کونجێکی دێرەکەما بسرەوم چاکترە.

شابانوی گەورەو گران خۆی دا بەسەر پێلاوەکانی راسپۆتینا و وتی:

– لێت ئەپاڕێمەوە ئەی باوکی پیرۆز ... بەجێمان مەیەڵە، پەیمانت ئەدەمێ کە هەموو توانام بەخت ئەکەم لەگەڵ (نیقی) هەتا ئەو دوژمنە سەر بزێوانە بە گەورەترین سزا بگەیێنێ!

راسپۆتین بە منجە منجێکەوە وتی:

– هەتا گراندۆقەکانی کوڕە مامیشی؟

ئیتر راسپۆتین جارێکی تر بە پەستێیەکەوە وتی:

– ئافرەتەکە! دوژمنایەتی خەڵکی لەگەڵما گەیشتۆتە ڕادەیەك هەتا لەناو خانەوادەکەتانا ڕاوەدووم ئەنێن، هیچ دەرمانێك نیە چاری ئەم دەردە بکا، بۆیە لە بڕیارم پاشگەز نابمەوە.

شابانو چاوە فرمێسکاوییەکانی لێ بەرزکردەوەو وتی:

– ئەی کوڕەکەم؟!

– کوڕەکەشت نەخۆشییەکەی تواو زێفی لێ ئەسێنێ.

پاشان پشتی تێکردو پێی پێوەنا بێ ئەوەی بەزەیی بە گریانیا بێتەوە.

لەڕاستیا راسپۆتین ناحەقی نەبوو چونکە ئەیزانی کە جێنشین بەرەو

پەرێشانی ئەچێ، بەر لە دەرچوونی لە پترس بورگ دەستی کرد بە نوقلانە لێدان لەبارەی حاڵ و ئەحواڵی وڵاتەوە بەهۆی تەنگوچەڵمەی ئابورییەوە، چونکە ئاگاداری بازاڕ شێواوی بوو کە بە چ ڕادەیە ئابوری وڵات هەرەسی هێناوە، ئەویش بەهۆی پەیوەندی لەگەڵ سیخوڕەکانی ئەڵمانا.

نوقلانەکانی راسپۆتین هەمووی هاتە دی، نەخۆشی بەتەواوی جێنشینی پەرێشان کرد، هەتا قەیسەر ناچار بوو بگەڕێتەوە سەر ئەوەی کە راسپۆتین پیاوێکی پیرۆزە، بەوەی وای گومان ئەبرد کە بۆیە جێنشین پەرێشانە چونکە توڕەیەو لە جێنشین دوورکەوتۆتەوە. لەوانەشە قەیسەر لەو باوەڕەدا بووبێ کە ئەبێ پیاو چاك چاوپۆشیان لێبکرێ وە بۆیان ئەلوێ ئابڕووی خەڵکی پایەماڵ بکەن بەبێ ئەوەی سزا بدرێن!

ئایا ئەگونجێ خوا بەیەك چاو سەیری ئەولیا و سەرتاپای خەڵکی تر بکا؟!

ئەمە جگە لەوەی شابانو هەمیشە دەنوکی لەسەر قەڕاڵ بوو، بەوەی دڵی پیاوی پیرۆزی ڕانەگرتووە، بۆیە خوا قینی گرتووە لە بنەماڵەی قەیسەری ڕوسیا و سوپا و گەلەکەشی، چونکە نەیان توانیوە ڕێز لە پیاوی پیرۆز بگرن و تۆڵەی بۆ بسێنن لەوانەی دەست درێژیان کردە سەری!ئا بەم جۆرە قەیسەر لەئاست ئەم گێژەڵۆکەیەدا بەناچاری نوشتایەوە، کە ئەبوایە بە پێچەوانە پەیمانی خۆی ببردایەتە سەر و بهاتایە زەبروزەنگ بنوێنێ لەڕووی دوژمنەکانی راسپۆتینا کەچی چووە سنوری بۆ دەسەڵاتی راسپۆتین کێشاوە، هەتا خەڵکی کەوتنە سەر ئەو باوەڕەی کە دوورخستنەوەی راسپۆتین نیشانەیەکی سەرەتاییە بۆ پاك کردنەوەی دەست و دایەرەکەی، کەچی لەناکاو ئەوانەی کەوتنە ژێر بەرداشی سزای توند و تیژەوە کە بەرهەڵستی راسپۆتینیان ئەکرد، راسپۆتینیش لەو ناوەدا وەك بەرزەکی بانان بۆی دەرپەڕی.

قەیسەر لەتەك شابانودا کەوتنە هەلەکە سەما، کەوتنە ناردنی بروسکە بەدوایا، تکای گەڕانەوەیان لێ ئەکرد بۆ کۆشکی زستانە، بەوپەڕی ڕێز و

سەربەستی یەوە.

هەموو هەوڵ و تەلاشی بنەماڵەی قەیسەری لە تەك قەیسەرا چاوی نوساوی قەیسەری نەکردەوە.

بەوەی قەیسەر خۆی کوێر و کەڕ و لاڵ کردبوو، نزیکترین خزمەکانی خۆی ئەگۆڕییەوە لە پێناوی گەڕانەوەی راسپۆتینا، چونکە باوەڕی وابوو ژیانی جێنشین بەستراوەتەوە بە قایل بوونی ئەو نەگریسەوە.

ڕۆژ بەڕۆژ نوسینی پەیام و نامە و بروسکەی قەیسەر بۆ راسپۆتین شێوەی پاڕانەوەی پتر ئەبوو، هەتا گەیشتە سنوری گەردن کەچی لەئاستیا، ئەوەتا قەیسەری هەموو ڕوسیا لەبەردەم راسپۆتینا وەك کۆیلەیەکی گەردن کەچی بەردەمی خوایە.

راسپۆتین خۆی بەناز ئەفرۆشت، بە تیتاڵییەوە خۆی زویر کردبوو، بە ئارەزووی دڵی خۆی زۆر بە ئاسودەیی ژیانی ئەبردەسەر.

بەشێوەیەکی ئاشکرای ئەوتۆ پڕ کێشی و تەراتێنی پەرینی لەناو ئەو ئافرەتە رەبەنانەدا ئەگێڕا کە ژنە گیانیییەکانی خۆی بوون، کە ئەو هەڵسوکەوتەی ئەو بە هەستی کەسا نایەت، وە کەس نەیتوانیوە ئەوەندە بێ شەرم بێ.

پاشان هەرچۆنی بوو خوسا و دڵی نەرم بوو کە وڵامی تکاکانی قەیسەر بداتەوە بە گەڕانەوەی ڕاستەوخۆی بۆ کۆشکی قەیسەری، هەر بە گەیشتنی بە کۆشك و چوونی بۆ سەر جێگای جێنشین و چاو برینە چاوی تەندروستی جێنشین بەرەو باشی چوو، بەوەی جێنشین دەم و دەست داوای نان خواردنی کرد، کە چەند ڕۆژ بوو ئارەزووی خواردنی تۆرابوو، شابانو لەتەك کچەکانیا بەچۆکا هاتن و دەستیان ماچ کرد.

کە قەیسەر خۆی هاتە لای جێنشین و نیشانەی بوژاندنەوەی لەڕووی کوڕەکەیا بەدی کرد ئەویش بەچۆکا هات و دەستی ڕاسپۆتینی ماچ کرد و داوای لێبوردنی لێ کرد، هەروەها بە راسپۆتینی ڕاگەیاند کە چۆن کوڕە

مامەکانیشی دوور خستۆتەوە بۆ قەوقاس و ئەوانەی زمانیان لەوەوە داوە بەسزای سەخت گەیەنراون.

بەم جۆرە گەرداو دامرکایەوە، راسپۆتین لەم ساتەیە سەرلەنوێ هەڵسایەوە سەرپێ، کە ئەویشی بەهۆی لوت بەرزی و هەڵەوەڕییەوە بەسەری هات بەڵام ئەم جارە نەك هەر چووەوە دۆخی جارانی و بەس، بەڵکو بەهێزتر و دەسەڵات فراوانتر بوو.

ئەوەتە قسەکەی کە کردبووی بە تەواوی هاتە دی بەوەی کە ئەی وت من قەیسەری ڕاستەقینەی ڕوسیام.

ئەم هەموو شتانە ڕووی دا و بە هەزاران ڕۆڵەی ڕوسیا بەهۆی ناپاکی ئەم نەگریسەوە مردن لەپێناوی بنەماڵەی شەق و شڕی بێ دەسەڵاتی قەیسەرا.

ئەوەبوو شابانو خۆی ئەڵمانییەك بوو بە گۆشت و خوێن و ئارەزووی، بۆیە ئەو کوژراوانە بە دوو ئاگر ئەسوتان یەکەمیان ئاگری ئەڵمان لە کۆڕی شەڕا، دووەم ئاگری ئەڵمان لە ناوەوە، ئەو ئەڵمانانەی خۆیان خستبووە ناو جلوبەرگی نیشتمان پەروەر و بازرگان و دڵسۆزانی ئیمپراتۆریەت، بەڵام هەمووی بۆ چاوڕاوو بووبە درۆ.

کێشە!

ئەگەرچی گەڕانەوەی راسپۆتین بۆ کۆشکی زستانە و پەرەسەندنی دەسەلاتی ئەو گێژەلۆکەیەی هەڵ بوو بوو لە دژی توانی کپی بکا، بەلام ئەو هەموو کوشتن و برین و دەست درێژی و دەم دووریی خەڵکە بوو بە هۆی بڵندبوونەوەی ئاگری خەشم و قین لە دڵ و دەروونی میللەتا وەك چۆن بوو بەهۆی یەکخستنی ئازادی خواهان لە پێناوی ڕوخاندنی دەسەلاتی ئەك ناپاکەدا.

بۆیە لە ساڵی ۱۹۱٦دا کۆمەڵەیەکی نهێنی پێکهێنرا لە گەورە پیاوان و نیشتمان پەروەر و ئەندامانی ئەنجومەنی دۆما، وە لە دژی کۆمەڵە (حزب)ی شابانو و راسپۆتین ڕاپەڕین و ڕاست بوونەوە.

ئەو کۆمەڵەیەی ڕوسیای بەرەو لەناوبردن و ئابڕووچوون و شکاندن ئەبرد، دروست بوونی ئەم کۆمەڵەیە هەنگاوێکی گەورە بوو بۆ توندبوون و سەخت بوونی کێشەی نێوان ئەو دوو بەرەیە کە شەڕی مردن و ژیان بوو.

سەرکردەی گشتی سوپا ژەنراڵ برۆسیلۆف پێشەنگی ئەو ڕق و هەڵساوانە بوو، بەوەی لە گەرمەی جەنگا داوای هەر جۆرە یارمەتیەکی ئەکرد لە ئازوخەو جلوبەرگ و تەقەمەنی هەرگیز بۆی جێبەجێ نەئەکرا، بەناچاری لەبەرئەوە هۆیانە دووچاری کشانەوەبوو، ئەمە لە کاتێکا ئەبووایە لەسەر ڕۆیشتنی ئەو هێرشە بێ وێنەیەی کە دەسی دابوویە بڕوا، ئەگەر ئەو شتانەی داوای کردبوو لەکاتی خۆیا پێ ی بگەیشتایە غلیۆمی ئیمپراتۆری دووچاری مۆرکردنی ئاشتی ئەکرد بەجۆرێ لە بەرژەوەندی سوێند خۆران بێ.

کەچی بە جۆرێکی ئەوتۆ شکستەی خوارد کسپەی لە دڵی دڵسۆزان هەڵ ئەساند، چونکە سەربازەکانی هیچ نەبوو بیخۆن هەروەها جلوبەرگیش نەبوو هەتا خۆیان لەسەرما بپارێزن لەو گۆڕە ئاواڵەیەدا کە

یەك پارچە بەفرو بەستەڵەك بوو، ئەم حاڵە نالەبارەی ئەمان دوژمنی هاندا بۆ هێرش بردن و بەرگری ئەمانیش زۆر ئەکەوت لەسەریان چونکە زۆر جار لەبەر بێ گوللەیی و بێ باروتی بە چەکی سپی خۆیان لە دوژمن ئەپاراست.

سەرکردە ڕوسەکان لە گەڵ شوێنا بەبێ شەڕ و کێشە ئەکشانەوە و هەڵئەهاتن، چونکە لەمێژ بوو خۆیان بە ئەڵمان فرۆشت بوو بە پارە و دراوی زێڕی بریسکەدار.

ئەم ناپاکیانە بووە هۆی لەناوچوونی (ڕۆمانیا) بەوەی سوپای ڕوس خۆی بەری ڕێگای بۆ مارشاڵ (ماکنزن)ی ئەڵمانی بەرەڵا کرد، هەتا سوپای بە خوێن تینوی جەرمەنی خۆی بکا بە شاری بوخاریستا (پایتەختی ڕۆمانیا) کە بە پاریسی ڕۆژهەلات ناوی دەرکردبوو.

هەر لەم کاتەدا سوپای فەرەنسە و سوێند خۆرەکانی تەنگیان پێ هەڵچنرابوو، بەڕژانی خوێنێکی زۆر نەبووایە شوێنەکانی خۆیان پێ نەئەپارێزرا.

هەر لەم کاتەشا بوو کۆمەڵەی شابانوی ڕوسیا ئەلکسەندرای ئەڵمانی کەللە ڕەق، ئەو هەوالانەی بەوپەڕی خۆشییەوە ئەقۆستەوەو زەماوەندی گەورەی گەرمی بۆ ئەگێڕا لەناوجەرگەی پترس بورگا، زەماوەندی سەرکەوتنی نزیکیان!

ئەم دەستە و تاقمە کەمەی ئەڵمان هیچ دەربەست نەبوون بە دەربڕینی هەستی ڕاستەقینەی دڵ و دەروونیان، چونکە سەرکەوتنی ئەڵمانیایان بەلاوە مسۆگەر بوو، هەرگیز جێگای گومانیان نەبوو، کەوابوو بۆچی بترسن و خۆیان بشارنەوە؟

سەرۆك وەزیران (شتۆمەر) کە لە نەژادی نەمساوی بوو، هەمیشە لەسەر لوت بەرزی خۆی دەقی گرتبوو، هەروەها برادەرەکەی وەزیری جەنگ

بەردەوام بوو لەسەر دزینی بودجە خۆ پڕ چەك کردن، برادەرەکەی تریشی وەزیری ناوخۆ (برۆتۆبۆبۆف) ئێشکچی و پارێزگەری ژیانی سیخوڕەکانی ئەڵمان بوو لەهەمان کاتا کەوتبووە سەر خۆش کردنی سەرپێ گرتنی پیلانەکانیان، بەڕاستی پاسەوانێکی دڵسۆز بوو بۆ پاراستنی مافی پەیوەندی ڕێگەی هاتوچۆ کردنی ئەو سیخوڕانە، ئەم هەموو یارمەتییە گەورانەی بە خەرواری زێڕوزیوی ئەڵمان ئەگۆڕیەوە.

بەڵام پیاوی گەورە راسپۆتین سەرچۆپی هەڵپەڕکێی ئەم دۆقە ناپاك و چەپەڵەی بەدەستەوە بوو.

هەتا حاڵ و ئەحواڵی لەم سنورەش تێپەڕی کرد و ئیتر کۆمەڵەی ئازادی خواهان کوڕە مامێکی تری قەیسەریان نارد بۆ دیدەنی و چاو پێکەوتنی قەیسەر، ئەویش گراندۆق میخائیلۆفیتش بوو، لە خاوێنترین میرەکانی ڕوسیا بوو، ڕۆشنبیرێکی زیرەك و بەتوانا بوو، ڕووی کردە کۆشکی زستانە بۆ چاوپێکەوتنی قەیسەر، ڕاستەقینەی حاڵ و ئەحواڵی لە وزە بەدەری خستە بەردەمی، بەوپەڕی سەربەستی و چاو قایمیەوە، داوای دەرکردنی دەستە و دایرە پیس و بۆگەنەکەی شابانوی کرد، بە تایبەتی لابردن و دورخستنەوەی راسپۆتینی چەپەڵ، کە بنەماڵەی قەیسەری کردە پووش برنج لەبەر چاوی خولەکانی داهاتوو، لەبەردەم خوێنەرانی مێژوو ئەوەندەی مێژوو دۆستی لەسەر ڕووی ئەم زەوییە بمینێ.

قەیسەر هەروەك جاری جاران کەوتەوە دوودڵی، نەیتوانی بڕیارێکی یەکجاری بدا، وەویش نەك بەوەی باوەڕی بەڕاستی قسەکانی گراندۆقی کوڕەمامی نەبوو نەخێر لەبەر ئەم هۆیە نەبوو، بەڵکو لەبەر بودەڵەیی و بێ دەسەڵاتی خۆی بوو، کە نەیئەوێرا قسە لە قسەی شابانودا بکا تاکو ئەگەر ئەو قسەیە ئەرکێکی گەورەی سەرشانیش بووایەو بەرژەوەندی دەوڵەت و بنەماڵەی قەیسەریشی تیا بووایە.

ئەم جۆرە وتووێژانە لە راسپۆتین نە ئەشارایەوە بەوەی چاوی بەکرێ گیراوەکانی ناو کۆشکی زستانەی قەیسەریان تەنی بوو، بۆیە راسپۆتین بە چاو قایمیەکی زۆرەوە رووی کردە بارەگای قەڕاڵ و داوای روونکردنەوەی حاڵ و ئەحواڵی لێکرد، وەك بیەوێ دەستە چەورە چەپەڵەکەی لە تاوانباری دا بەم و بەو بسڕێ!

لەبەردەم قەیسەرا دەورێکی شانۆیی وای نواند وەك کەسێك وەحی و الهامی بە هەموو دەنگیەوە شیرانی:

– قوڕ بەسەر ئەو کەسانەی ئاسمان نەفرەتیان ئەکا، بە بۆنەی دڵپیسی و گومان کردنیانەوە لە ئاستمانا، وا ئەزانم لەمێژە پەنجەی خۆت گەستووە، ئا لەو جارەوە کە بەجێمهێشتن، بەجۆرێك نەك هەر پەشێوی کەوتە ناو ماڵتەوە بەڵکو هەتا کاروباری میریشی گرتەوە، ئەو ڕوداوانەی پێشوو بەس نیە بۆ چاوکردنەوەتان ئەی نیکۆلا؟.

ئیتر کەوتە گێڕانەوەی ئەو قەومانەی روویان دابوو ئەو کاتەی لێیان دوور کەوتبووەوە بۆ سیبیریا، دیارە بەیاد هێنانەوەی تێکچوونی تەندروستی جێنشینی لەبیرنەکرد.

پاشان دەستی پێکردەوە:

– هەرچیەکم پێ وتبوون هەمووی هاتە دی، بە جۆرێ کە ناتوانیت دان بە راستیانا نەنێیت، کەوابوو لەبەرچی ئەگەڕێیتەوە سەر باری گومان کردن و شکاندنم؟

قەیسەر بە شپرزەییەکی تەواوەوە کەوتە منجە منج:

– من هەر لەسەر باوەڕی خۆمم ئەی باوکی گەورە و گرانم..

– بەڵێ بەڵێ! ئەمە قسەیە.. وا دیارە لە قسەی رووت بەولاوە هیچی ترت لەبارا نیە بەڵام من بەقسەی رووتی ناکەم و کردەوەم لە تۆ ئەوێ...

هەر لەگەڵ ئەم قسانەیا بوو کە پارچە کاغەزێکی نایە بەردەستی

قەیسەر هەتا بۆی مۆرکا ئەگەر ڕاست ئەکا، کاغەزەکەشی بریتی بوو لە لیستەیەکی نویٚ لەناوی ژمارەیەکی تر لە پیاوانی دڵسۆز و ئازادی خوا، بە دوورخستنەوەیان لە کاروباریان وە لیستەیەکی تر بەناوی ئەو ناپاکانەوە کە ئەبیٚ جیٚگاکانیان بگرنەوە، کە ئەمانیش هەمووی لە لایەنگرانی ئەڵمان بوون بۆ پڕکردنەوەی ئەو شوێنە گرنگانەی چۆڵ ئەبوون بەلابردنی ئەو پیاوە دڵسۆزانە، کە بەزۆری ئەو کارو فرمانانە لەڕیزی سوپادا بوون.

ڕاسپۆتین بەمەشەوە دا نەنیشت، داوای دورخستنەوەی دەم و دەستی هەندیٚ لە ئەندامانی بنەماڵەی قەیسەری کرد، لەوانەی دووبەرەکی لەگەڵا ئەکەن و پیلان لەدژی شاز ئەکەن و خەڵکی لیٚ ئەوروژیٚنن، کەچی قەیسەر ئەوەندە گەوج و ریش گاو بوو بەئاسانی خۆی دا بەدەم ڕاسپۆتینەوە، ئەو کاتەی قەیسەری بەجیٚهیٚشت هەموو داخوازیەکانی جیٚبەجیٚ کرابوون...

لەگەڵ ئەوەشا ڕاسپۆتین دڵنیا نەبوو بەوەی هەواڵی ناپاکیەکانی بەسەر زاری هەموو خەڵکەوە بوو، هەر چاوەڕوانی دەرفەتیٚك بوون هەتا یەك بەیەکی دەستە بۆگەنەکەی پارچە پارچە بکەن کە خەریکی کنەبوون بەو نیازەی وڵات بخەنە کەندەڵانی لەناوچوونەوە...

بەڵیٚ لەبەر مەترسی پۆلیس ڕاسپۆتینیان ئەپاراست، ئەو پۆلیسانەی ئیش ئەکەن کە لەژیٚر چاودیٚری برادەر و داردەستەکەی خۆیا، واتە وەزیری ناوخۆ (برۆتۆبۆبۆف)، ڕاسپۆتین ئەوەندەی لە خۆپیشاندەرەکانی شەقامەکان تۆقی بوو سەد هیٚندە لە کوشتنی ناکاوی و پیلانە نهیٚنیەکان و نارنجۆك نانەوە و دەمانچە لیٚ هەڵکیٚشان زراوی چوو بوو.

بۆیە ڕاسپۆتین بڕیاری دابوو کە سەرەڕیٚ بە دوژمنەکانی بگریٚ، ئەویش بەوەی لەژیٚرەوە لەگەڵ دووکەس لە ناپاکەکان ڕیٚك کەوت بۆ گفتوگۆ بانگی کردبوون، پاشان گورزی گرانی خۆی داوەشانەوە،بەوەی سەر

لەبەیانیەك بانگی ڕاهێشت لەناو خەڵکا بە گوناهبار کردنی دوو ئەفسەری گەورە لەسەر کردەی بەرزی سوپا کە خۆیان بەدوژمنی نیشتمان فرۆشتووە ئەو دووانەش ژەنراڵ (مۆسلۆفسکی) و ژەنراڵ (رۆزن) بوون پاشان بەڵگەی گوناهەکانیشی خستنەڕوو.

ئەمەش بۆ راسپۆتین کارێکی گەلێ سوك و ئاسان بوو، چونکە هەر خۆی ئەم دوو سەرکردەیەی فریو دابوو وە هاویشتبوونیە باوەشی ناپاکیەوە بۆ دوژمن، لەلایەن ئەو سیخوڕانەی لەبەردەستی خۆیا ئیش ئەکەن.

بەگورجی بڕیاری گرتنی ئەو دوو ژەنراڵەی دەرکرد، نەیان توانی هیچ پەلە قاژەیەك بکەن، هەموو شتێکیان بۆ دادگا ڕوون کردەوە، بەوەی شاگرد و بەردەستی راسپۆتینن لە ناپاکی دا، لێرەدا راسپۆتین بەدەرکەوت کە چ بلیمەتێکە لە نانەوەی داوا بۆ ئەم و ئەو، بەجۆرێك راسپۆتین ڕووی کردە ئەندامەکانی دادگای سوپا کە هەر واقیان وڕما لە قسەکانی کە وتی:

– ئا بەم جۆرە ئەم دوو ناپاکە ئەیانەوێ تۆڵە لەو کەسە بسێنن کە ناپاکیانی ئاوەڕووت کردووە...

پاش ئەمە شانێکی هەڵتەکان و خۆی بێدەنگ کرد!

بڕیاری دادگا بەسەریەکەوە دەرچوو بە تیرەباران کردنی ئەو دوو ژەنراڵە، ئیتر هەر بۆ بەیانی ڕۆژی ئاینده لەناوبران بەدەم چەپڵە لێدانی گەرم و گوڕی خەڵکیەوە!.

بۆ بنج بەست کردنی ئەم کارە ئەو ژنە سیخوڕەی لە نێوانیانا بوو، ئەویشی خستە ناو ناوانەوە هەتا خنکێنرا، بەم جۆرە خۆی کردە فریشتە لەبەردەم گەلی ساویلکە و سادەدا ... هەتا وای لێهات خەڵکی ئەیان کێشا بە دەمی ئەو کەسەدا زمان ئەگێڕێ لە کردەوە پیسەکانی.

هەر بەدوای وەشاندنی ئەم گورزە گرانەدا، راسپۆتین بلاوی کردەوە کە

مەریەمی عەزرا هاتۆتە خەوی و پێی وتووە کە مۆمدانێکی پیرۆز لە سوچێکی هێڵەکانی جەنگا لە ژێر پوش و پەلاش و گەلادا شاراوەتەوە، کە بەگەڕان و هەڵکەندن دۆزیانەوە، ئیتر بە دەف و دایەرەیەکی گەورەوە گەیەنرایە پترس بورگ، بەمە گەل کەوتە سەر ئەو باوەڕەی کە ڕوسیا جەنگ ئەباتەوە چونکە موعجیزە هاتە دی...

ئەگورجی ئەم ئەفسەرەی مۆمدانەکەی دۆزیەوە پلەی بەرزکرایەوە بۆ پایەی ژەنراڵی، چونکە لەگەڵ راسپۆتین بەدزیەوە پێک هاتبوو لە هەڵسانی ئەم دەورە شانۆییە، ئەویش بە شاردنەوەی ئەو مۆمدانە لەو شوێنەدا پاشان بە دۆزینەوەی بۆ چاووراوکردن لە خەڵکی بۆ هەڵخەڵەتاندنیان.

بارئالۆزی

راسپۆتین بەمە خۆی قوتار کرد لە لەکەی ناپاکی و توانی شمشێری لە هەسان دراوی مردن لەسەر گەردنی خۆی بەرزکاتەوەو لابەرێ، ئەویش هەمووی بەهۆی تەڵەکەبازی و فرتوفێڵ و تۆڕنانەوەی بۆ ئەم و ئەو، هەتا توانی بە تەواوی خۆی بگرێتەوە، بەمە پایەی لەبەرچاوی خەڵك بڵندبووەوە، ئیتر هەواڵی دۆزینەوەی ئەم مۆمدانە بە هەموو لایەکا بڵاوبووەوە، ماڵەکەی بووبووە قبلەگای ژنانی شۆخ و شەنگی بنەماڵە گەورەکان، هەتا راسپۆتین خێرو بەرەکەتیان بەسەرا دابەش کا، ئیتر راسپۆتینیش کەوتەوە سەر نەریتی جاری جارانی بە ئابڕوو پایەماڵ کردنیان، وە بەبێ داپۆشینی ئەو کارو کردەوە ناشایستانەی، وە هەر ڕۆژە نەزم و بەزمێکی تازەی بۆ ئارەزووی لەوەڕانی جانەوەرانەی خۆی ئەدۆزیەوە، هەتا ئەتوانین بڵێین کۆمەڵەیەك (حزب) یا (نقابەیەك) دروست بووبوو لەو مێرد و باوکانەی شەرەفی ژن و کچەکانیان ئەم جانەوەرە دڕندەیە پێشێلی کردبوو.

سکاڵانامەی پەیتا پەیتایان ئەکرد بەگژ دەستە و دایەرەکانا هەروەها بەگژ هەڵسوڕێنەری کاروبارەکانی کۆشکا، بەڵام راسپۆتین بە سوکی و بە زەردەخەنەوە سەیری ئەو سکاڵا نامانەی ئەوانی ئەکرد، چونکە ئەیزانی ئەم ڕووداوە وردەڵانە لە خۆیانەوە ئەبن بەژێرەوە لەبەردەم ڕووداوە گەورەکانی هێڵی شەڕا کە بەتەواوی مێشکی خەڵکی خەریك کردبوو، لە هەمان کاتیشا ئەیزانی چۆن ئەم قسانە داپۆشێ بە ڕێگەی پێچ و پەنای تایبەتی خۆی.. لەپاڵ ئەمانەشا جاروبار ئەتەقیەوە بەڕووی هێندێ چەنەباز و هەڵەوەڕا لەوانەی زمان درێژیان ئەنواند بە لەکەدارکردنی بە ناپاکی، کە لەپاڵ ئەم لەکەدار کردنەیا داوای دوورخستنەوە و دەرکردنیان ئەکرد لە فەرمانە دەوڵەتیەکانا... وە جارجار داوایان ئەکرد

بە دەرکردنی بڕیاری خنکاندنی یا لەناوبردنی، بەوەی سەواو مامەڵە لەتەك دوژمنا ئەکا، ئەم جۆرە تاوانانە لە ڕۆژانی جەنگا بە ئاسانی بەسەر خەڵکا دا ئەسەپێنرێن.

شتێکی ئاشکرایە ئەوەی خەڵك بە کوشت بدا ئەکوژرێتەوە، با ڕەنگ و زووش بخایەنێ، ئەوەتا (میلیۆکۆف) ئەو نوێنەرە چەپەکییە چەند جارێکە، لە زنجیرە پیلانەکانا بۆ کوشتنی ئەم و ئەو ئەنەڕێنێ بە ئاشکرا ئەڵێ، راسپۆتینە ئەو پیلانانە ئەگێڕێ بەهۆی تاقمە پیاو کوژەکانیەوە بە پشتگیری بێگانە و یارمەتی ئەوان.

هەروەك چۆن نوێنەری دەستە ڕاستیش (بۆریشکیتش) پشتگیری کرد لەم دوچمنە سیاسیەی خۆی لەم بارەیەوە بەوپەڕی ئازایەتیەوە، هەرگیز دوو دڵی نەنواند لە تاوانبار کردنی سەرۆك وەزیران (شتۆمەر) بەوەی ئەویش هەر یەکێکە لە بەکرێ گیراوانی ئەڵمان...

درێژکردنی پەنجەی ئاشکرا بۆ ناپاکی ئەم چەپەڵە (ئەنجومەنی دوما)ی بەجارێ وروژان، لەگەڵ ئەوەشا بەبیری کەسێکا نەهات پەنجە بۆ ناپاکی قەیسەر ڕاکێشن، ئەگەر چی قەیسەر ئەیتوانی وڵات ڕزگار بکا بە داهێنانەوەی گورزێکی گران بۆ سەرپانکردنەوەی سەری ئەم هەژدیهایە و دەستە ژەهراویەکەی، بەڵام ئەم قارەمانێتیەیە لە بودەڵەی ڕوخاوی وەك قەیسەر ناوەشێتەوە.

ئەوەی کرا هەر ئەوە بوو (شتۆمەر) لە پایەی سەرۆك وەزیران هێنرایە خوارێ، بەڵام دەسەڵاتی لەناو کۆشکا هەر بەردەوام بوو، بەوەی کرا بە ڕاوێژکەری قەیسەر، ئەمە کە لە هەمان کاتا سەرۆکی کۆمەڵەی گورج و گۆڵی ئەڵمان بوو بەڵام لەژێرەوە..

ئەم شەڕی کێشەو دووبەرەکیەی ناوخۆ لە نێوان دەستەی ناپاکانی سەر بە شابانو لەدژی ئازادی خواهان لێرەدا نەکوژایەوە بەڵکو کەوتەڕوو،

ئەوە بوو لەوەو پێش نهێنی بوو، چەکی بەگژیەکا چوونیشیان بوو بە گەلێ چەشـن و بابـەت، وەك بـەیان بلاّوکردنـەوە و پـیلان سـازکردن بـۆ یـەکتر کوشتن، بە داو و توڕنانەوەی هەر دەستەیەك بۆ ئەندامانی دەستەکەی تر.

ئـا لـەم کاتـەدا کـە بـاری زرنگکـاری بـەرەو ئالۆزیـەکی تـەواو ئەچـێ سەربارێکی تـازە هاتـە سـەر ئەم بازاڕ شێواویـە، ئەویش بلاّوبوونـەوەی برسـێتی بـوو، ئـەوە بـوو ئـەوبینی خـەڵکی لـە شـەقام و خیابانـەکانا بـە هانـدانی نیشـتمان پـەروەرەکان لـە هـەمان کاتـا بـە هانـدانی ئەڵمانـەکان، چـــونکە کەوتنـــەوەی پەشـــێوی لەبەرژەوەنـــدی ئـــەوانیش بـــوو: خۆپیشاندەرەکان هاواریان ئەکرد و ئەیان وت:

– نان و ئاسایشمان ئەوێ!

ئـەو شـتەی پـتر ئـاگر و کڵپـەی بـەر ئەدایـە برسـیەکان ئـەوەبوو دەوڵەمەندەکانیان ئەبینی هەتا تەوقە سەریان نوقمە لە ڕابواردنی پڕ لە داوێن پیسی دا ئەمە لەکاتێکا خەڵك لەبرسا ڕەق هەڵئەهاتن و ئەمردن، وە بە ئازاری زگ هەڵگوشینەوە تلاوتلیان بوو.

کە ئەم هەواڵانە ئەگەیشتە بەر گوێی قەیسەر، گورج راسپۆتین هەڵی ئەدایەو ئەی وت:

– ئـا ئـەوەتا ئـەی نیکـۆلا ئـەبینی درێـژەدان بـە جـەنگ ئەبێتـە هـۆی قەومانی کارەسات کە بەر لە هەموو شتێ بنەماڵەی ئێوە ڕائەدات، ئەو دەمە دەورتان چۆڵ ئەبێ و کەس بە هاوارتانەوە نایەت، لەوانەی ئەمڕۆ خۆیـان لـە جلوبـەرگی دڵسـۆزیا ئەنوێنن بە بەرگی نیشـتمان پەروەرانـەوە خۆیان با ئەدەن، هەر ئەوانە ئەبن بە گورجی پشتت تێئەکەن وە خۆیان فڕێ ئەدەنە ناو زەلکاوی ناپاکیەوە لەدژتان.

بەم قسانەی راسپۆتین قەیسەری بودەڵە و ورەبەردەر لەترسا ئەلەرزی و بەگەردن کەچیەکەوە ئەی وت:

- ئەی باوکە کەوابوو ئەبێ چی بکەم؟

قەیسەر بە بیریا نەدەهات پاشگەز بێتەوە لەو گفت و پەیمانەی داوییە بە دەوڵەتە سوێند خۆرەکان چونکە هەنگاونان لەم بارەیەوە لەکەنان بوو بە شەرەفی شاهانەیا، کە بۆ ئەم لایەنە زۆر پەرۆش بوو.

بەڵام شابانو بە پێچەوانەی ئەوەوە ڕزگاربوونی بنەماڵەکەیانی بەستبووەوە بە گرێدانی پەیمانی جەنگ وەستاندن و ئاشتی لەگەڵ ئەڵمانا، بەهەر نرخێك بێ بەس ڕەچەڵەکی (رۆمانۆف) لەسەر تەختی قەیسەری فەرمانرەوا بێ، شابانو ئەو بیروڕایەی خۆی لە دەست و پێوەندەکانی نەئەشاردەوە، بەڵام ئەم قسانە لەناو خەڵکا بڵاوبووەوە، بەجۆرێ ڕقی هەڵئەساندن کە جێگا بەخۆیان نەگرن.

بەڵام قەیسەر ئەوە هەر هیچ کە دەسەڵاتی توابووەوە لەڕاست ژنەکەیا، نەیئەتوانی ورتەبکا یا ڕێگەی لێبگرێ بۆیە بۆ دوورکەوتنەوە لە دەست غەم و پەژارەی ناو کۆشك حەزی ئەکرد ڕووبکاتە کۆڕی جەنگ، هەتا هانی سەربازەکانی بدا بۆ خۆڕاگرتن، ئەویش بە بوونی لەناویانا و بە نزیك بوونەوەی لە هێڵی شەڕ.

بەڵام بوونی قەیسەر لە کۆڕی جەنگا هیچ ڕێگەیەکی ڕاست و ڕەوان نەبوو بۆ چارەسەر کردنی ئەو گیروگرفتانەی کەوتبوونەوە، چونکە کە کاسە پڕ بوو لەئاو نایگرێ و ئەڕژێ، هەروەها باری قات و قڕی و نەبوونی و برسێتی شتێکی شاراوە نەبوو لەبەردەم سوپادا، چونکە هەتا سوپا خۆشی بەبێ خواردن و جلوبەرگ و ئازووخە فرێ درابووە لاوە، سوپا خۆی بە نێچیرێکی سارد و سڕی بەردەستی سەرکردە ناپاك و نەزانەکان ئەزانی، ئەو ناپاك و نەزانانەی شاگردەکانی کۆمەڵەی شابانو بوون. کە کارو کردەوەیان بووبووە ناپاکی و دەست بڕی.

پیلان

جارێکی تر گراندۆقەکان خۆیان کۆکردەوەو سەر لەنوێ چوونەوە بۆ دیدەنی قەیسەر نیکۆلای کوڕە مامیان، زۆر لەبەریا پاڕانەوە کە بیکا بۆ خاتری شەرەفی بنەماڵە و تەختی شاهانەی دەستە ئەژنۆ دانەنیشێ هیچ نەبێ شتێك بکا، بەلای کەمیەوە ئەو هەژدیهایە لە کۆشکی زستانە دوورخاتەوە، کەچی قەیسەر هەر ئاوڕیشی لێ نەدانەوە، داخوازیەکانی جێبەجێ نەکردن، ئەو داخوازیانەی کە لە قولایی دڵی داواکارەکانیەوە هەموویان بەڕەوا ئەزانی، بۆیە بەوپەڕی پەستیەوە گەڕانەوە، چونکە هەرگیز وایان پیارانە ئەپەرموو کە گەردن کەچی بۆ راسپۆتین گەیشتبێتە ئەم ڕادەیە.

پاش ئەم جموجوڵە هیچیان بەدەستەوە نەما بۆ ڕزگاربوونیان لە راسپۆتین لە بەکارهێنانی هێز بەولاوە، ئەویش بە کوشتنی لەناکاوی لەپەناوە.

ئەم ڕێگەیەش دیسان بێ کۆسپ و تەگەرە نەبوو، چونکە گراندۆقێ یا ئەمیرێ هەرگیز دەستی نەئەدا لە بەر پلەوپایەی لە کۆمەڵا بەدەوری پیاو کوژ هەڵسێ لەبەردەم مێژوودا، ئەگەرچی زۆر جار بە دەستی ئەم و ئەو ئەهاتنە کوشتن.

هیچیان بۆ نەمایەوە لەوەبەولاوە بچن سکالای خۆیان لەکن لایەنگرەکانیان هەڵڕێژن هەتا لەڕیزی ئەو لایەنگرانەیانا هەرا بکەوێتەوە، ئەوانیش لە ڕاستیا کەوتنە بزوتنەوە بۆ هەڵسان بە کردەوەیەکی کاریگەر لەم لایەنەوە.

ئەمیر یۆسۆبۆف کە مێردی شازادە ایرین بوو، واتە کچە خوشکی قەیسەر نیکۆلا، لە هەموو کەس گەرمتر بوو بۆ سەرپێ گرتنی ئەم بیرە، لە هەمان کاتیشا یەکەمین کەسێکیش بوو لەناو خزم و کەسوکاری قەیسەرا کە راسپۆتین گومانی سەربزێوی و هەڵەشەیی لێ نەئەکرد، بەوەی

لەمەوبەر هەرگیز پەنجەی نەبووە لە پیلانە زرنگکاریەکانا و هەروەها لە کۆبوونەوەی نیشتمانیەکانا گوێی لە بیروڕای نەبووبوو کە ڕۆژێ لەڕۆژان لەدژی شابانو و کۆمەڵەکەی بدوێ، لەبەر ئەم هۆیانە چاکترین کەسێك بوو کە بتوانێ راسپۆتین بخاتەداوەوە.

لەلایەکی تریشەوە راسپۆتین وەك جاری جارانی نەمابوو، هۆشیار بووبووەوە بەتایبەتی لە هاتوچۆکانیا چواردەوری بە باڵبازی نهێنی ئەتەنرا، هەروەك چۆن باڵبازی سیاسیش پارێزگاریان لێ ئەکرد لە دەمی ئەوانەی ئەسرەوان کە لەناو خەڵکا پڕوپاگەندەیەکی لەسەر بڵاوئەکاتەوە بە سەریەکەوە خرابوونە کار بۆ پاراستنی ژیانی راسپۆتین لە هەموو پیلان و دەست درێژیەك.

ئەمیر یۆسۆبۆف بەزرنگی خۆی ئەو ڕاستیەیەی هەڵهێنا کە ڕێگا نیە ئەم درندە فێڵاویە بخاتە چاڵەوە لەو ڕێگەیە بەولاوە کە دەسەڵاتێ ئەو لاوازئەکا، ئەویش بەربەرەڵا کردنە بۆ ئارەزووی لە سنوربەدەری بەتایبەتی لە بارەی مێبازیەوە لەگەڵ ئافرەتانی شۆخ و شەنگا.

وە بۆ گێڕانی ئەم دەورە ئەبووایە ئافرەتێك بدۆزێتەوە کە بەتەواوی دەست بدا، لەوانە نەبێ قسە بدۆڕێنێ، چاونەترس و بەفێڵ و کارامەبێ، خۆی ڕاگرێ و نەکەوێتە ژێر هێزی موگناتیسی چاوەکانیەوە، بەبێ بوونی ئەم مەرجانە لە ئافرەتێکی وا هۆشیارا سەرکەوتن مەحاڵ بوو.

ئەوەی زانرا بوو ژن نەبووە لە راسپۆتین نزیك بێتەوەو لەدەستی دەربازبووبێ، یا هیچ نەبێ هەستی بەوە کردبێ کە دەسەڵاتی بەسەریا ئەشکێت چونکە راسپۆتین لەم ڕووەوە توانای لەڕادە بەدەری سروشتی ئاشکراو شاراوەی هەبوو لەبەر ئەم هۆیانە ئەمیر یۆسۆبۆف سەرسام و چەواشە بوو کە ژۆن ئافرەتێك هەڵبژێرێ بیکا بە هاوکاری خۆی بۆ سەرپێگرتنی ئەم پیلانە پڕ مەترسیە.

لەپاش بیرکردنەوەیەکی زۆر نیازی سەقامگیر بوو لەسەر هەڵبژاردنی (کاترینا)ئەو بووکە شۆخ و شەنگ و سەماکەرەی کە دۆست و ئاشنا و خۆشەویستی هەموو گراندۆقەکان بوو، وە تێکەڵیەکی تەواوی لەگەڵ چینە بەرزەکانی کۆمەڵ هەبوو، لە هەمان کاتا سەماکەرێکی گەمی باڵی بوو، دەمار توندی لە گەمە و وەرزشە گرانەکانیا ئەوەی ئەگەیان بتوانێ لەئاست توانای زەبری چاوەکانی راسپۆتینا خۆی ڕاگرێ.

لە ڕاستیشا (کاترینا) نمونەیەکی پاك و بێگەردی جوانی بوو، دەم و چاوی خنجیلە و ئێسك سوك بوو لەش و لارێکی ڕێك و پێکی پێوە بوو، سەرەڕای ئەم بەهرانە لە جوانیا، کیژێکی دڵپاك و سەر سەختیش بوو، لەبەر چاو قایمی لە هیچ مەترسیەك سڵی نەئەکردەوە، بە مەرجی ئەو چاو قایمیەی ببوایەتە هۆی دڵخۆش کردن و قایل کردنی ئەو خاوەن چاکانەی، کە گەڵێ چاکەیان لەسەر بار کردووە، کە ئەوانیش هەر گراندۆقەکان بوون.

ئەمیر یۆسۆبۆف لە پێشترین کەسێك بوو لەلای لەم ڕووەوە، ئەمە لەکاتێکا بوو بووە نەریت بەلای پیاوانی چینی بەرزەوە، ئەبوایە هەر یەکێکیان دۆستێکی سەماکەری ئۆپێرای هەبێ، هەتا خودی قەیسەریش سەماکەرێکی بەناوبانگی بەدئست گرتبوو کە ناوی (تشیسنسکا) بوو، تەلارێکی بۆ ڕازاندبووەوە بەرامبەر کۆشکی زستانە.

ئەمیر یۆسۆبۆف، ئەیزانی کە راسپۆتینی چەپەڵ لە تازە پیاکەوتووەکانە، حەز ئەکا شوناسی لەگەڵ بەناوبانگترین سەماکەرێکا بگرێ لەوانەی ئیش ئەکەن لە ئۆپێرا، بەتایبەتی ئەوانەی کە ئاشنایەتی هەر لەتەك گراندۆقەکانا ئەگرن، دیاری پێری ژنە گیانیەکانی راسپۆتین لەم بابەتە کەم بوو!

ئەمیر یۆسۆبۆف پیاوێکی بەزمان و وتە خۆش بوو ئەیتوانی بە

بیروباوەڕی نیشتمانی جۆش و خرۆشی ئەو کیژە سەماکەرەبدا، کە چارەنوسی ڕوسیا وەك مێو و ڕۆن وایە لەناو دەستیا، بەوەی ئەبێتە ڕزگارکەری ڕوسیا، مێژوو ناوی بزرناکا لەو لاپەڕانەیا کە ناوی قارەمانانی ڕوسی تیا تۆمار ئەکرێ، بەم وتانە کیژە خوسا و پەیمانی دا بە ئەمیر کە بە ئەرکی خۆی هەڵسێ، بێ ئەوەی دەربەست بە تەگەرەی سەر ڕێ و مەترسیەکانی ئەم ئیشە گرنگە بێ.

لێرەدا ئەمیر ڕاستەوخۆ بە (کاترینا)ی وت کە هەر لەوە ئەترسێ کە خۆی ڕانەگرێ لەبەردەم هێزی چاوەکانی ئەو چەپەڵەدا، وە بچێت ئەمیش وەك ئافرەتانی تر خۆی بدات بەدەستەوەو بەربەرەکانییەکی پێ نەکرێت لەتەکیا، ئەم چەند وشەیە کاری خۆی کرد لە دەماری کاترینادا، بۆیە سوێندی خوارد کە لەم ڕووەوە سەرسەخترین ئافرەتێك بێ، هەرگیز وێنەی نەبێ لەناو هەموو ئافرەتانی کۆشکا.

ئەمیر بەم پەیمانە کیژەی کەمەندکێش کرد و بەستیەوە، ژوانی لەگەڵا بەست کە هەر ئەو شەوە بیکا بە راوکە بەو نیازەی ڕاسپۆتین بخەنە داوەوە.

## داو نانەوە!

شەوێکی تۆف بوو لە شەوەکانی مانگی ڕێبەندان، بەجۆرێ هەناسەی مرۆڤی تیا سوار بوو پیاوی ئەخستە گریان، پێچە کلوی بەفر یەك بەدوای یەکا بە بێدەنگی ئەهاتە خوارێ بەرگێکی زۆر سپی ئەکردە بەر پایتەختی قەیسەرەکان ئەو بەرگە هەر لە کفنی مردوو ئەچوو دڵی مرۆڤی ئەگووشی، شەقام و خیابانەکان چۆڵ و هۆڵ بوون، نە هاتوچۆ هەبوو نە دەنگی ڕەوڕەوەو پێچکەی گالیسکە و داشقەکان لەوانەی بەسێ ولاغ ڕائەکێشرێن کە شارەکانی ڕوسیا بەو گالیسکانە ناوبانگیان دەرکردبوو، تاپۆی

جەنگی تۆقێنەر باڵی شومی کێشا بوو بەسەر شاری پترس بورگا، ئەو شارە گەورەیەی هەر چەند هەفتەیەك لەمەوبەر شوێن کۆڕی زەماوەند گرتن بوو، کەچی وا ئێستا بەرگی پەژارە و پرسە و ماتەمینی پۆشیوە.

حاڵ و ئەحواڵ ئەو هەستەی ئەدا بە خەڵك کە ئەبێ هەموو چاوەڕوانی ڕووداوێکی ئەوتۆ بکەن کە ئەو پایتەختە گەورە و گرانە بخاتە هەژان و سەر بەرەو ژێری بکا، بەجۆرێ کۆشکی زستانە بخاتە هەژان و لەرزە بە زنجەکانی شارەوە ... خەڵکی بە هەناسە سواری و شپرزەیی لەودیو دەرگا خڕ کلۆم و داخراوەکانیانەوە بیریان لە دواڕۆژی ڕەشی خۆیان ئەکردەوە هەموو دڵنیا بوون ئەو شەوە ڕۆژ ناکەنەوە بە بێ قەومانی کارەساتێکی پڕ لە مەترسی، چونکە خەڵکی بە مەرەیەك چووبوون ئەگەر ئاوڕت لە هەر لایەك بدایەوە چاوت بە ناپاك و پیلانگێڕ و دز و تاڵانکەر ئەکەوت، ئیتر پیاوێك کە دەستی بە کڵاوی خۆیەوە گرتبێ با نەیبا لەوانەی حەز بە ئاژاوە بەرپا بوون ناکەن ئەبوو هەر ئێوارەیان لێهات خۆیان بخزێننە ماڵەوەو لەکون دەرنەچن...

بەڵێ ئا ئەمە بوو حاڵ و ئەحواڵی پترس بورگ، شەقام و کوچە و گەڕەکەکان ئەو ماڵانەی لێ دەرکەی کە تەرخان کرابوون بۆ فیتنەگەری و ئاژاوە نانەوە یا بۆ شەوڕۆژ کردنەوە بە ڕابواردنی ئابڕو پایەماڵ کردن ئەگەر چی بەڕواڵەت لەسەر دەرگاکانیان نوسرا بوو چێشتخانەن ئیتر ماڵی کەس ورتەی لێ بڵند نەئەبووەوە، چێشتخانەی چی؟ کەی خواردن و خۆراك لە پترس بورگ چنگ ئەکەوی، بەتایبەتی لەم ڕۆژانەدا؟ نان لە یاقوت کەمتربوو، مەگەر تەنیا لەو شوێنانە کە دەوڵەمەندە داوێن پیس و پاشڵ تەڕەکان ڕوویان تێئەکرد، کە بۆ کڕینی خۆشی و ڕابواردن بە خەروار پوڵ و پارەیان خەرج ئەکرد بۆ خواردن و خواردنەوە و داوێن پیسی قومار.

بیـانوی کردنـەوەی دەرگـای ئـەو شـوێنە پـڕ سـوکی و کەمیانـە لـەو ڕۆژانـەدا، لاف و گـەزاف لێدانی نیشتمان پـەروەری بـوو، بەڵێ نیشتمان پـەروەری کرابـووە بیـانو بەچـنگ ئـەو ڕەوشـت چـەوتانەوە، بـەڵێ بەرزکردنـەوەی گیـانی ورە بەرنـەدان لـەناوخۆدا کـارێکی پێویسـتە بـۆ سەرخستنی جموجوڵی سـوپا بـەڵام بـەو جۆرەنا کـەوا ئـەو بێ ئابڕووە سوکانە دەستیان دابوویە!

ئـەو سـەرباز و ئەفسـەرانەی بـە سـیلە (ئیجـازە) بـۆ چـەند ڕۆژێـك ئەگەڕێتەوە بۆ شارەکان غەم و پەژارەیانی تیا بە با بدەن، بەڵام لەڕاستیا ئەگەر کەسێك لەو جەنگاوەرانە بەسەر و گوێلاکی خۆڵاویانەوە بە پێ و پێڵاوی پینە پینـاوی شـەق و شـڕی شـەقار شـەقاریانەوە بە لـەش و لارە شەکەتەکەیانەوە لەو سیپاڵە شڕ و وڕانەیانا شەرمی تیا نەکردایە و خۆی بکردایە بـە دەرگایـەکی ئاوەڵـەی تیـا تروخانەیـەکا بـەو بیـانوەی خـاوەن خزمەتە لە کۆڕی جەنگدا وا ئێستا هـاتووە کەمێك بحەسێتەوە، وەك ئەو هەموو داوێن پیسە بێ ئیش و کارانەی لەتەك ئافرەتە دەعباکانا شەمپانیا فـڕ ئەکـەن لـە بـەخت و تەندروسـتی قارەمـانێتی ئـەو، ئـەوە بـەگورجی نۆکـەرەکان هـەر بە نوکـە شـەق و شـەپەزلە و پـاڵ پێوەنـان دەریـان ئـەکرد چونکە دەقی رازاوەی شوێنە ئارایشت کراوەکە ئەشێوێنێ!

وا ئەمشـەو قەشـە راسـپۆتین لـە یـەکێ لـەك تیاترۆخانانـەدا چیچـکەی کردووە لەتـەك دەسـتە و دارەیـە ناسراوەکەیا، وا پـەیتا پـەیتا شـەمپانیای گرانبـەها هـەڵ ئـەدا، لەسـەر خوانـەکانی دەوروپشـتی ژمارەیـەك باڵبـازی نهێنی جیاجیا خۆیـان مـەڵاس داوە بۆ پاراستنی ژیـانی ئـەو ناپاکە، ئیتر ئەو شـوێنە پـان و بەرینـە جمـەی ئـەهات بـەو هـەل پەرسـت و دەوڵەمەنـدە تازە پیاکەوتووانەی کە لە ڕاستیا تالانکەری نان و پارووی هەژارانن.

شـوێنەکە جمـەی ئـەهات بـەو قۆنتـەرات چیانەی ئازووخـەی سـوپایان

کـەوتبووە ئەسـتۆ، جمـەی ئـەهات بـە بازرگانـانی بـازاڕی ڕەش، جمـەی ئـەهات بـەو ناپاکانـەی بـە لـەش فرۆشـتنی ئافرەتـە دەعباکـان ئـەژیان، هـەروەها جمـەی ئـەهات بـە ژمارەیـەك لـەو ئەفسـەرە خۆبـەنا فرۆشـانەی هـەرگیز ڕوو ناکەنـە کۆڕەکـانی شـەڕو پیشـەیان بووبـووە خـۆ لەوەڕانـدن لەسـەر ئـەو تیاترۆیانـەی لـەو جـۆرە شـوێنانەدا ئـیش ئەکـەن، یـا لەسـەر کەسـوکاری لەپێشـی پیـاوە خـاوەن دەسـەڵاتەکان درابوونـە پێنـووس، هاوبەشـییان لـە شـەڕو شـۆڕا خۆنوانـدن بـوو بـە شـۆڕبوونەوەی شمشـێرە درێژەکانیان بە لاقەدیانا ئەویش هەر لە زەماوەندەکان و تیاترۆخانەکانا. بەڵام سەرشانیان ئەبریسکایەوە بە ئەستێرە و نیشانی سوپایی بێ ئەوەی بۆ تەنیا جارێك چاویان بەکۆڕی جەنگ کەوتبێ، وا لێرەدا بە گوێگرتن لە ئاوازی مۆسیقا و بزوتنەوە و کەمەرگرتنی ئافرەتە شۆخ و شەنگەکان کات و ڕۆژ بەسەر ئەبەن.

ئەم ژمارە سەیرە گەورەیە وا هەموو ڕائەبوێرن و خواردنی نایاب لرف و لووش ئەدەن و شەراب فڕ ئەکەن و زۆریـان بـێ هـۆش و گـۆش، وڕوکـاس بـوون هـەرگیز ئاگایـان نیـە لـەوەی هـەزاران بێـوەژن و هـەتیو هەرچـەند هەنگاوێ دوورە لەوانەوە شەو بەگریان ڕۆژ ئەکەنەوە.

سەیر لەوەدا بوو شانۆ بچکۆلەکەیان (رازابووەوە) بە ژنە سەماکەرێکی پان و پۆڕ بە دەنگێکی تیژ گۆرانی ئەوت، کە بەناو سرودێکی نیشتمانی بوو، کەچی لەڕاستیا لەو گۆرانیانە بوو ئارەزووی ئەوروژان، لەشێوەی مەنەلۆجێکی سوك و بێ بەهادا.

دیسان ئەوەش هەر سەیر بوو هاڵوێك لەو خەڵکەوە بڵند ئەبووەوە هەتا خوا حەزکا بۆگەن بوو، ئەگەرچی بەدیمەن دانیشتووەکان خـاوێن و شـۆخ و شـەنگ ئەکەوتنـە پـێش چـاو، چـونکە زۆر لـەو نـەدی و بدیانـە پـتر بیـو هۆشیان لای ئەموستیلەی گران لەپەنجە کردن بوو، ئەوەنـدە دەربەسـت بە

خۆشتن و نینۆك كردن نەبوون! لەشی خۆیان پڕ لەبۆن و بەرامەی خۆش ئەكرد كەچی هەرگیز بیریان لە خۆشتن و چوونە گەرماو نەكردبووەوە، بۆیە لە بیست هەنگاو دوور لەوانەوە پیاو كاس ئەبوو.

ئا لەم شوێنەدا بۆنی ئارەقە كردنەوەی لەشیان تێكەڵ ئەبوو بە بۆنی شەراب و دووكەڵی جگەرەكانیان، هەتا دانیشتن لەو شوێنەدا پیاوی قانگ ئەدا، بەڵام هاتوچۆكەرانی ئەو شوێنە ئەوەندە ئاگایان لای بۆن و بەرامەی خۆش و ناخۆش نەبوو چونكە هەستیان مردبوو بۆیە ئەوان ئەو شوێنە بۆگەنەیان بە بەهەشتێكی دەستكرد دائەنا یا لەوانەیە بە بەهەشتێكی خواكرد بدەنە پێنوس كە بەر لە ڕۆژی لێپرسینەوە و زیندووبوونەوە خوا بەم بۆگەنانەی خەڵات كردبێ!

كەوابوو ئا ئەم شوێنە پیرۆزە بوو كە راسپۆتین ئەو شەوەی تیا بەسەر ئەبرد.

ئا لەم شوێنەدا لەناو بەزم و ڕەزم و هەرای ئەو جانەوەرانەدا كە هەر یەكە لە ئاوازێ بوو، لەناكاو ئەمیر یۆسوبۆف خۆی كرد بەژوورا، ئیتر هاتنە ژوورەوەی بەجارێ سەرنجی هەموو خەڵكەكەی ڕاكێشا، چونكە لە ئامشۆكەرانی ئەم جۆرە شوێنە سوكانە نەبوو، ئەگەرچی بوون و دانیشتنی كەسانی وەك ئەو خۆشی ئەگەیان بە ئامشۆكەرانی شوێنەكە كە زۆربەیان لە نەدی و بدیان بوو.

ژمارەیەك لە دۆست و ئاشنایانی خۆی لەگەڵابوو، لەگەڵ چەند ئافرەتێكی شۆخ و شەنگا، لە سەرو هەموو ئەو ئافرەتە جوانانەوە قەڕاڵیچەی جوانی، سەماكەری بەناوبانگ (كاترینا)بوو.

## خۆڕاگرتن

بەڕێوەبەری تیاترۆخانەکە لەخۆشیانا کە چاوی بە ئەمیر یۆسۆبۆف کەوت هەر وەك گوڵ گەشایەوە، بەوەی بێزیان هاتووە و سەریان کردووە بەلای ئەوا بۆ ڕابواردن، بۆیە بەگەرمی بەپیریانەوە چوو بۆ خزمەت کردنیان وە بۆ ئەوەی جێگەیەکی باش بۆ ئەم میوانە گەورەیە تەرخان بکا، چەند کەسانێك لەوانەی بارگران بوون بەسەر شوێنەکەوە، هەڵیسانن بەناچاری چوون لە باڕی ئەمریکی لەگۆشەی ئەوپەڕی تیاترۆخانەکە دانیشتن.

ئەمیری ناوبراو بە گرانیەکەوە لە شوێنەکەی بۆی ڕێکخرا دانیشت، چوار دەوری لەلایەنگرەکانی خۆی بوون، دوای دانیشتن داوای نان خواردنێکی نایابیان کرد لە خواردنەکانی ژەمی ئێوارە لەو خواردنانەی کارگەکانی فەڕەنسە سازیان ئەکا.

قەیسەر لەم دووایانەدا خواردنەوەی شەرابی حەرام کردبوو بەهۆی پەستی و ورووژانی ڕەمەکی خەڵك و لە هەمان کاتیشا لەبەر ڕاگرتنی دڵی ئەوان لەم بازاڕ شێواوی جەنگەدا، بەڵام ئەم بڕیارەی قەیسەر هەر لە شوێنە بچوکەکانا جێبەجێ ئەکرا، نەك لەم شوێنانەی پایە بەرزەکان ڕوویان تێئەکرد.

دانیشتوانی شوێنەکە زۆر بەختیاربوون بەدانیشتنی کەسێکی وا پایە بڵند لەناویانا، چونکە ئەمە دوور لە نەریتی تایبەتی بوو، هەر ئەمە بووە هۆی گرنگی و قسەکردن لەسەر سەماکەرە شۆخ و شەنگەکەی لای ڕاستیەوە دانیشتبوو، خۆی خەریك کردبوو بە گوێگرتن لە وتووێژێکی گەپاوی سەیر، چونکە ناوە ناوە ئەی دایە قاقای پێکەنینێکی ئاواز خۆشی بێ بڕانەوە.

بەڵام ڕاسپۆتین وەك دەر ئەکەوت لە هەموو دانیشتوانی شوێنەکە بێ

ئارامتر بوو، بۆیە چاوی بڕی بووە سەماکەرەکە بەێ ترس و لەرز، ئەویش لەسەر نەریتی دەربەست نەبوون و شوڵ لێهەڵکێشانی تایبەتی خۆی، بەڵام هیچی لێ هەڵنەکڕاند، لەم سەماکەرە بەژن لاولاوەی کە دەموچاوی ئەتوت پارچە بلورێکە سەنگ تەراشێکی هونەرمەندێکی خستووە، راسپۆتین بەهیچ جۆرێك نەیتوانی سەرنجی ڕاکێشێ وەك ئەو هەموو هێزە موگناتیسیەی چاوەکانی راسپۆتین نەکرابێتە سەر ئەو بۆ ڕاکێشانی، بە پێچەوانەی خواست و مەبەستی راسپۆتین ئافرەتە بەبێ ترس شانێکی بۆ هەڵتەکان و ڕووی لێ وەرچەرخان، کە ئەو بزوتنەوەیە بەلای راسپۆتینەوە لە کفر بەولاوەتر بوو.

راسپۆتین لە خۆڕاگرتنی ئەم ئافرەتە پەست بوو لە هەمان کاتیشا بە بەزینی خۆشی قایل نەبوو، بۆیە بڕیاری دا کە سەرلەنوێ تێهەڵچێتەوە، چونکە بەتەواوی سوور بوو لەسەر ڕاوکردنی بێچیرو ئارەزوو تێرکردنی لە گۆشتی ئەم نێچیرە، بۆیە لەجێگای خۆی هەڵسا و ڕووی کردە سەر ئەو مێزەی ئەمیر یۆسۆبۆف لەسەری دانیشتووە، ناسیاویەکی زۆر کەمیان لەبەینا بوو، کەچی چوو بێ شەرم رکدن لەگەڵیان دانیشت هەتا بێ ئەوەی پرسیان پێبکا.

ئەمیر وای پیشان نەدا کە دانیشتنی بەبێ پرسی راسپۆتینی چەپەڵی لەبەر دڵ گرانە، بەڵکو دڵخۆشی و پێخۆش بوونی نواند، وەلە ڕاستیشا دڵ خۆش بوو چونکە ئەم هەنگاوەی راسپۆتین نیشانەیەکی سەرەتایی سەرکەوتنی پیلانەکەیەتی، بۆیە ئەوپەڕی قەدرو ڕێزی بەرامبەر راسپۆتین نواند.

راسپۆتین ئەم زمان شیرینی و چاك و چۆنیەی ئەمیری بەساکارانە وەرگرت، چونکە بەلایەوە بووبووە شتێکی سروشتی کە ئەبێ هەموو کەس ماستاوی لەبەر ساردبکاتەوە ئەمە لەلایەك لەلایەکی تریشەوە

هەموو هەست و نەستی لای (کاترینا) بوو، کە بەتەواوی چووبوو بەدڵیا پاش ئەوەی لە نزیکیشەوە بەتەواوی لێی وردبووەوە، وای دانابوو کە باشترین پارچەیەکە دەست ئەدا کە بیهێنێتە ڕیزی (ژنە گیانی)یە تازەکانی‌یەوە، بۆیە هێزی چاوە دۆزەخیەکانی لێ ڕاگرتبوو ئەو هێزەی کە بەر لە ئێستا بە سەدان ئافرەتانی لە پەل و پۆ خستبوو.

لە ڕاستی لانەدەین ئەگەر بڵێین سەماکەرەکەمان هەستی بە دڵگوشراوی و هەناسە سوارییەکی تەواو کردبوو هەروەك چۆن هەندێ جار خەوتوو توشی تەنگە نەفەسی ئەبێ، توانای جوڵانەوە و هاوارە لەبەر ئەبڕێ، ئا لەم حاڵەتانە بۆ مۆتەکەو مێردەزمە دائەنێن کە لەخەوا سواری سنگی خەوتوو ئەبێ، بەڵام لوت بەرزی و لەخۆبایی بوون قەڵغانی خۆپاراستنی کاترینا بوو بەرامبەر ئەو هێزەی کە بەربەرەکانی کردنی ئاسان نیە، لەگەڵ ئەوەشا ئەم بووکە سەماکەرەیە جڵەوی ئارەزووی خۆی لەدەست دەرنەچوو.

هەتا ڕاسپۆتین خۆی واقی وڕما لەم بەربەرەکانیە کە بە هیچ ئافرەتێکەوە نەیدیوە، بۆیە ڕاسپۆتین خۆی لە (کاترینا) نزیك کردەوەو چرپانی بەگوێیا:

– بەیانی سەعات سێی پاش نیوەڕۆ چاوەڕوانیت ئەکەم، ئەبێ بێیت بۆلام.

کەچی ڕاسپۆتین سەرنجی‌دا کیژە سەرسامی پیشان ئەدا بەرامبەر بە قسەکانی بۆیە کەوتەوە قسە کردن و وتی:

– من وام ئەوێ .... گوێت لێ بوو؟ لەگەڵ ئەم قسانەیدا دەستە زلەکانی خستە سەر شانە ڕووتەکەی وەك کەسێك دەست بەسەر ماڵی خۆیا بێنێ، لەڕاستیا، سەماکەرەکە هەستی بە تێکچوونی خۆی کرد، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا، بە دەنگێکی پچڕ پچڕەوە وتی:

– ئەی باوکە ... بیریکی لیٚ ئەکەمەوە! ....

راسپوٚتین بەمە دەستی هەلگرت، چونکە ئەوەندە باوەڕی بە سەرکەوتنی خوٚی هەبوو، لەو باوەڕەدا بوو کە هەموو شتیکی بوٚ ئەچیتە سەر هەروا بە ئاسانی بوٚیە هەلسا و بەدلشادییەوە گەڕایەوە سەر میزەکەی یەکەمجاری، پاش ئەوەی خواحافیزی لەگەل یوٚسوٚبوٚف کرد بەجوٚریك هەر وەك گالتەی پیبکا، کە گەیشتەوە شوینە کوٚنەکەی و دانیشت بەکەندەردوو دەستی کرد بە چەنەبازی لەسەر ئەم ڕاوکردنە تازەیەی، بەجوٚریٚ بە کیژەکەیا هەلئەخوینٚد کە بەتەواوی پلەی جانەوەری و دڕندەیی خوٚی ئەخستەڕوو، دەسە و دایەرەکەی کەوتنە پیروٚزبایی لیکردنی بەوەی هیچ نیچیریٚ خوٚی لەئاستیا ڕاناگریٚ.

## کوٚل نەدان

بوٚ بەیانی ڕوٚژی ئایندە لەو ژوانەدا کە دابنابوو بوٚ کاترینا چاوە چاوی هاتنی سەماکەرە شوٚخ و شەنگەکەی ئەکرد، بەلام چاوەڕوانی بیهودە بوو، لە ڕاستیا وا شیتگیر بوو بوو لە داخانا لیوی لیٚ ئەکروٚشت، بەلام واقووڕمانی راسپوٚتین لە پەست بوونی گەورەتر بوو، چونکە ئەمە یەکەم جارە لە ژیانیا دەسەلاتی بەسەر ئافرەتیکا ناشکیٚ، بەلام بەوەی راسپوٚتین باوەڕی تەواوی بە تواناى خوٚی هەبوو، ئەمە لەلایەك و جوانی سیحراوی کیژە لەلایەکی ترەوە لەباری سەرسامی و توڕەبوونیان سوك کرد، بوٚیە ئەگەڕا بوٚ بیانو بوٚ نەهاتنی بدوٚزیتەوە، خوٚی بە خوٚی ئەوت بەلکو توشی نەخوٚشیەکی ناکاوی بووبیٚ، یا مردبیٚ یا بەلکو ئەمیر یوٚسوٚبوٚف دەرگای ژووری لیٚ کلوٚم دابیٚ لەبەر پیناخوٚش بوونی...

کە خوٚی بەم لیکوٚلینەوەیە خاو کردەوە، لەمال دەرچوو هەتا هەوالی تەواوی نەهاتنی بزانیٚ، لەو کاتەدا کە لە گوٚڕەپانی (نیفسکی) ئەپەڕیەوە

لـوت و بـزوت بـەرەنگاری ئـەمیر یۆسـۆبۆف بـوو، بەڕوویـەکی خۆشـەوە دەسـتی ئـەمیری گوشـی، بـەبێ پێشـەکی هـەواڵی (کاترینـا)ی لێ پرسـی، ئەمیر لە وەڵاما وتی:

- هەر ئێستا لەلای ئەو بووم، لەسەر تۆ گەلێ قسەی بۆ کردم...

ڕاسپۆتین بە منجە منجێکەوە وتی:

- چی وتووە؟

- بـە پیـاوێکی سـەیرت دا ئـەنێ، گـەلێ شـڵەژاوە هـەتا تۆقیـوە لێـت، لەبەرئەوە ناوێرێ بێتە دیدەنیت بەهەر نرخێك بێ...

- ئەرێ ئەوە بەڕاستتە؟ بەڵام من هەر ئەمەوێ چاوم پێ‌ی بکەوێ.

ئەمیر سەری ڕاوەشاند و وتی:

- ئەی باوکە وابزانم ئەمە هێندە سوك و ئاسان نیە.

ڕاسپۆتین لە خواستی ئەمیر تێنەگەیشت بۆیە بە لوت بەرزیەکەوە وتی:

- ئەبێ ئەو کەسە کێ‌بێ کە ئەوێرێ نەیەڵێ چاوم پێ‌ی بکەوێ؟

ئەمیر یۆسۆبۆف بە دەم پێکەنینەوە وتی:

- هـەر چۆنێك بـێ ئـەو کەسـە مـن نیم! بەڵکو مـن هـەموو توانـام بـەخت ئەکەم کەوا لە کاترینا بکەم نەترسێ لێت.

ڕاسپۆتین شیڕانی:

- کـەوابوو لێـی ئاسـانتر نیـە: ئەمشـەو لـە شـوێنی دوێنـێ شـەومان دا ئەنیشمەوە هەتا تەواو بوونی شانۆ، بەڵکو بتوانی لەتەك خۆتا لیهێنـی بۆ ئەوێ.

پاشـان ڕووی خـۆی وەرچـەرخان و ڕۆیشـت، بـێ ئـەوەی چـاوەڕوانی وەڵامـی ئـەمیر بکـا، چـونکە وای دانـابوو کـە قسـەکانی بڕیـارە هەڵوەشاندنەوەی بۆنیە، هەتا ئەگەر بەرامبەرەکەی ئەمیریش بێ!

لـە ژووانـی نـاوبراوا ڕاسـپۆتین ڕووی کـردە تیاترۆخانەکـە، گـەورەترین

ژمارەیەك لە باڵبازی نهێنی دەورووپشتیان گرتووە لە جلوبەرگی پیاو ماقوڵانا، هەر ئەوەندەی لە دەرگا چووە ژوورەوە دەم و دەست ڕوخساری گەش بووەوە چونکە چاوی بە ئەمیر کەوت دانیشتووە لەگەڵ هەمان دەستە دایرەی شەوی ڕابردوودا، (کاترینا) لەناوەڕاستیانا وەك ئەستێرە ئەدرەوشایەوە، راسپۆتین بەسەربەستیەوە چوو بۆلای، بەڵام سەماکەرەکە رووی خۆی لێ وەرچەرخان بە پەست بوونێکی ئاشکراوە، پاشان بیانویەکی دۆزیەوە بەوەی شەکەتەو بۆی دەرچوو.

راسپۆتین بەتەك ئەمیرەوە دانیشت لەسەر نەریتی خۆی کەوا دەربەست بەکەس نیە و کەس لەخۆی بەگەورەتر نازانێ، کە بە دووچاوی سەری خۆی دی سەماکەرەکە بۆی دەرچوو بە ئەمیری وت:

– وا بزانم پاش قەیرێ ئەگەڕێتەوە...

ئەمیر بە پێکەنینەوە وتی:

– بەڵکو هەڵهات ئەی باوکە ... چونکە ترساندت ....

راسپۆتین قیڕانی:

– ئای لەم خۆ بەناز فرۆشتنە! ئەئاوا ئەیەوێ تیتاڵیم پێ بکا...

هەر ئەمە بەتەنیا بەس بوو بۆ هەڵگیرسانی ئاگری کەللەیی و بەرچاو تاریك بوون، چونکە ئەمە یەکەمجارە لەژیانیا ئافرەتێك بوێرێ گاڵتەی پێ بکا، لەو هەموو ژنانەی دیونی لە ژیانیا هەرچەند جوان و پایە بڵندیش بوو بن لە کۆمەڵا!

ئەمیر یۆسۆبۆف لەبنەوە هەر ئاگری تووڕەبوونی راسپۆتینی بە قسەو پلاری هەڵەق و مەڵەق خۆش ئەکرد، وەك ئەم قسانەی چاوك و وردە تەڵاش بێ بۆ خۆشکردنی گڕی ئاگرێکی گەورە کە ئەخرێتە ژێری، پاش ئەم قسانە ئەمیر هەڵسا و قەشەی ناموبارەکی پیسی بەجێهێشت هەتا بەدەم غەم و پەژارەوە هەر خۆ بخواتەوە...

راسـپۆتین –بـۆ یەکـەمجار لـە ژیانیـا– بـە ئـێش و ئـازاری خۆیـەوە ئەتلێتەوە، ئەمەش سەرەتای خۆشەویستیەکی ڕاست بوو بەلای ئەوەوە. ئەو بەسەدان ئافرەتانەی ڕاوی کردبوون وە لێی خواردبوون هیچ بایەخ و نرخێکیان نەبوو لەئاست ئەم کیژە سرکەی بۆی دەستەمۆ نابێ و هەڵدێ لە دەستی، بۆیە سوێندی خوارد کە بەرۆکی بەرنەدا، وە هەموو توانایەکی بخاتە کار بۆ گەیشتن بە ئاواتی دەروونـی بە لـەوەڕان لە باغی بەهاری جوانی ئەو گیژە تیاترۆیەدا!

چەند ڕۆژێك تێپەڕی بەسەر ئەم ڕووداوەدا، لەم چەند ڕۆژەدا راسپۆتین نان و ئاوی لەبەرچاو کەوت، جێی بەخۆی نەئەگرت، شەقام و کۆڵانەکانی پترس بورگی ئەپێواو ئەگەڕا بەدوای کاترینادا، بەڵام سەماکەری ناوبراو خۆی لە ماڵی ئەمیر یۆسۆبۆف شاردبووەوە بە شەو و بەڕۆژ دەرنەئەچوو، هەتا دەستی لەئیشی سەر شانۆش هەڵگرت.

راسـپۆتین تانجیـەکانی ڕاوی بڵاوکـردەوە، کـە ئـەوانیش باڵبـازە نهێنیـەکانی بـوون، بـەڵام هیچیان هەڵنەکراند، بۆیـە راسپۆتین هـەر ئـەوە نەبوو شێت ببێ لەداخانا، بەوەی هەموو جارێك مایەپوچ دەرئەچوو لە تەکیا، هەتا وای لێهات لە هەرزەکارێکی سەرەڕۆ ئەچوو کە دڵداری ئارام و ئۆقرەی لەبەر هەڵگرتبێ، شەوقی چاو پێکەوتنی کیژە لە کەللەی دابوو، ئیتر بەبێ پەروا بەبێ ترس و لەرز بەتاقی تەنیا بە کۆڵان و کۆچەکانا ئەگەڕا، ئەگای لەوە نەمابوو کە مەترسی لە هەموو لایەکەوە هەڕەشەی لەناوبردنی لێ ئەکا ئەو مەترسیانەی کە لەوەو پێش لە ڕاستیانا زارە ترەك ئەبوو.

کە گەڕانی کۆڵانان تەواو شەکەت و وەڕسی کرد، بەوەی بەو هەموو ماندووبوونە هیچی هەڵنەکراند، ڕووی کردە (تساکوری سیلو) کە بارەگای هاوینەو دێهاتی بنەماڵەی قەیسەری بوو... شابانوی پەژارەدار پێشوازی

لێکرد، راسپۆتین لە شابانوی پرسی:

– ئایا تەندروستی کوڕەکەت بەرەو خراپی ئەچێ؟

– هەمیشە بەئازارە، ئەی باوکە، بە بوونت لەناومانا چاوم ڕوون ئەبێتەوە، تکا ئەکەمتەشریفتان بەرنە سەر جێگاکەی بەڵکو ئەمە خوایە هیمەت و بەرەکەتان دا ئەباریێ بەسەر سەریا، بەلاّم پەژارەیەکی ترە زۆر سنگم ئەگوشێ.

– ئەزانم باری سیاسی ولاّت بەرەو مەترسی ئەچێ، بەلاّم بەوەی من لێرەم... ئیتر قسەکەی تەواو نەکرد، هەر بە دەست جولاّندن گاڵتەی بە ڕووداوی پاشە ڕۆژ ئەکرد.

شابانو هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی:

– بەڵێ داخی گرانم! وا ئەزانی کە هەمیشە لێرە ئەبی؟ ... من دڵنیات ئەکەم کەهۆی هەموو غەم و پەژارەم ئەوەیە کە لە کانگای هەستمەوە لەوە گەیشتووم کە ژیانت لە مەترسی دایە...

راسپۆتین لێی توند بوو وتی:

– لەبەرچی ئەم قسانە ئەکەی...

شابانو بە پەستیەکەوە کەوتە گێڕانەوە: قەیسەر گەڵێ سکالاّنامەی هەڕەشاوی پێ ئەگا، هەمووی لەسەر ئێوەیە، نازانم هۆی ئەو هەموو ڕق و کینەیە لە خەڵکەوە چیە لەسەر تۆ، ئەبێ شەیتان پەنجەی هەبێ لەم وروژانەدا، ئەوەی جێگای واق ورمانە ئەوەیە هێندێ لەو سکالاّدەرانە لە پیاوانی کڵێسەکانن، لەگەڵ ئەوەشا لای ئێمە تۆ هەر ئەو کەسەی کە لە هەموو کەس خواناستری... هێندێکیان ئەو ژنە بەڕێوەبەرانەی دێری ژنە ڕەبەنەکانن کە گوایا ئەڵێن تۆ دەست درێژیت کردۆتە سەریان...

راسپۆتین قسەی لەدەم قۆستەوە چونکە لە وزەیانەمابوو:

– ئایا هەڵەوەڕی ئەوانە ئەسەلمێنن؟

شابانو کەوتە پاکانە بۆخۆی:

– نەبەخوا باوکە، خوا بەو ڕۆژە نەکا! هەتا ئێستا لەبەرچاوم هەر پیاوی هەڵبژاردەی خواو نوماییندەو نێراوی خوای بۆ ڕزگارکردنی خۆم و کوڕەکەم و بنەماڵەکەشم...

هەرگیز ئێوە جێگای لەکەو تاوان نین، بەڵام زۆری ئەو پلارانە دڵم ئەخەنە مەترسیەوە بەرامبەر بەژیانت، ئای خوایە خۆت ئاگاداری کە چەند ئەترسم لەوەی شتێکت بەسەر بێ.

ڕاسپۆتین ناوچەوانی دا بەیەکا و وتی:

– وا من ئەم قسەیە ئەڵێم و ئەیڵێمەوە باش گوێت لێم بێ:

– ئەگەر شتێك بەسەر من بێ ئەوە بزانە ئەو بنەماڵەیەی ئێوە بە نەفرەت ئەکرێن، بەشێوەیەکی ترسناك هەر لەدوای کوشتنی من لەناوئەچن ئەمە ئیرادەی ئاسمانە!

پاشان چەمایەوە چلیپای لەسەر دەموچاوی خۆی چەند جارێك کێشا وەك بیانبەستێتەوە بەو نەفرەت و چارەنوسەشەوە...

هەر لەم هەناسەیەدا گەورەی کەنیزەکەکانی کۆشك (ئانا) خۆی کرد بەژوورا، ئاگاداری کرد لەوەی کە ئەبێ هەرچۆنێك بێ بەتەنیا نەچێتە دەرەوە چونکە ژیانی لە مەترسیدایە، بەوەی داو و تۆڕی زۆری بۆ نراوەتەوە بەتایبەتی لەژێر باڵی ڕەشی شەوا، ڕاسپۆتین بە توندبوونەوە شیڕانی بەسەریا:

– ئەم قسە هیچ و پوچانەتان لەچییە؟!

ئەوەی گوێی لە دەنگتان بێ وا ئەزانی لە گیانەلادام و بەبان سەرمەوە ئەلاوێنەوە، پاشان سەرێکی لێ بادان و دای لە قاقای پێکەنین. ئای چەند مردن لەمێشکی دوور بوو، چونکە هەموو بیری بەستبووەوە بە تاقە شتێکەوە، ئەویش چێشتن و مژینی تامی ژیان و زیندەگی بوو لە

ڕازاوەترین شێوەدا، ئەو کیژۆڵەیەی کە ئاگری تێ بەردابوو لیکی بە لالغاوەیا شۆڕ ئەکردەوە، دانە جیڕەی گەیانبوویە، بەجارێ فڕێی دابووە ناو ئاگری ڕق و ئارەزووەوە.

کە شابانو بەو جۆرە راسپۆتینی دی دەربەست نیە، سەری ڕاوەشان و بەلێوبەباریەکەوە وتی:

- بەگەرمی لەخوا ئەپاڕێمەوە کە چاوی لێتەوە بێ و لە هەموو بەلاو ناخۆشییەك کە ناحەزانت بۆ تۆیان ئەوێ بەدووربی و خوا ئاگادارت بێ.

قەشە بەتوندی وەڵامی دایەوە:

- ئەو دوعایە بۆ خۆت و کوڕەکەت بکە، ئەگەر لە دوعاکەت هیچ شێن ئەبێ.

پاشان پشتی کردە شابانو و ئانا وە بە توڕەییەوە بۆی دەرچوو، هەتا لەسەر گەڕانەکەی بەردەوام بێ، بەدوای پەری شێوەکەیا کە ئەوەندەی تر کەم چیکڵدانەی کردبوو، خواردن و ژیانی لێ تاڵ کردبوو، هەر فڕی بەسەر کارامەیی و دووربینییەوە نەمابوو هەتا بتوانێ خۆی بپارێزێ لە دەست درێژی دوژمنەکانی.

**زیافەت و زیافەتکاری**

ئـەوەبوو راسـپۆتین شـابانوی بەجێهێشـت و گەڕایـەوە پـترس بـورگ، بەگورجی ڕووی کردە ماڵەوە لە شەقامی (جۆرۆکۆفایا) لەوێ چاوی کەوت بە پەیامێك لە ئەمیر یۆسۆبۆفەوە نوسرا بوو بەپەلە کردیەوە.

ئەمیر ئەو پەیامەی بۆ نوسی بوو بەقسەی قوت قوت رازانبوویەوە هەتا سەرو دڵی بکرێتەوە، نوسی بووی کە: (کاترینـام بـۆ خوسانووی لەمەولا ئەوەندە توند و تیژ نەبێ لە تەکتا) وا دیار بوو بەم قسانە دڵی نەرم بوو، نوسرا بوو بەوەی (کیژە پەشیمانی دەربڕی وە کە لەسەر ڕەوشتی لاساری خۆی بەردەوام نەبێ)، وە ئەمیر پەیامەکەی بەمە کۆتایی پێهێنابوو، (کە هەر ئەمشەو ئەگەر باوکی بەڕێز راسپۆتین بەچاکی ئەزانێ ئاهەنگێکی بۆ ئەگێڕم هەتا بە ئاواتی دڵی بگا لەو ئاهەنگەدا).

دیسان بۆی نوسی بوو: (ئا بەم جۆرە ئەی باوکە ئەمبینی چاوەڕوانیت ئەکەم لەکاتی دەرچوونی خەڵك لە شانۆ کە بەیەکەوە نانێکی سوکی ئێوارە بخۆین.

وە من لە چەند کەسێکی کەم بەولاوە کە برادەری گیانی بەگیانی خۆمن کەسێکم بانگ نەکردووە، کە هەموویان لەوانەن ڕابواردنیان خۆشە و دیسان ئەبمە هۆی ناسیاویتان لەگەڵیانا، یەك دوو لە دەستە خوشکە شۆخ و شەنگەکانی خۆشی لەتەکیا ئەبن).

بەدوای ئەم نوسینەدا ئەم دێڕەشی بۆ دڵ ڕاگرتنی راسپۆتین نوسی بوو: (هەروەها خاتوونی خێزانیشم پێ خۆشحاڵ ئەبێ کە ناسیاوی لەگەڵتا پەیداکا!.

شێوەی نوسینەکەی ئەوەندە ساکارانەبوو بە جۆرێ کەم و زۆر هەستی راسپۆتینی نەوروژان چونکە تەنیا بیرکردنەوەی لەوەی بەو ئاواتە گەورەیەی ئەگات، ئاواتی گەیشتنی بەو کیژەی دڵبەندی عەشقی بووەو بەڵام دەمی نایگاتێ، هەر ئەمە بەتەنیا توانای بیرکردنەوەی راسپۆتینی سووانبوو

نەیئەتوانی بیر لە شتێکی تر بکاتەوە، ئەمە بەتەنیا بۆ ئەو بەس بوو، بۆیە وەك گای بەلەسە بەرەو ئەوداوەی بۆی ترابووەوە ملی نا.

راسپۆتین بەوپەڕی کامەرانییەوە پەیامەکەی ئەخوێندەوە، کە وتووێژەکانی کۆشکی قەیسەری بیرکەوتەوە کە هەر ئەو سەر لەبەیانیە لەوێ ژنە دەم ڕەشەکان نوقلانەی چیان بۆ لێئەدا، لەبەر خۆیەوە کەوتە بۆڵە بۆڵ و تیتاڵی پێکردنیان:

– ئای کە ژنان چەند کوللو پوچن، چەند گەوجن، هەتا ئەوانەی لەسەر تەختی حکومڕانیش چیچکەیان کردووە! لەکاتێکا ئەوان بۆیان قڕاندم کارەساتی شومم توش ئەبێ، ئا ئەوەتا بە پێچەوانە بەپیر خۆشترین ڕوداوێکی ژیانمەوە ئەچم... شەگا! شەگا!

هەر لەم هەناسەیەدا لە دەرگای ماڵەکەی درا، کە راسپۆتین دەرگای کردەوە، چاوی بە کۆنە برادەرەکەی واتە بەرنابای گەورە و گران کەوت کە بە تەواوی چرچاوی هەڵبزڕکا بوو، نیشانەی پەشۆکانێکی پڕ لە مەترسی، دەم و دەس بە راسپۆتینی وت:

– هاتووم ئەی کاکی خۆم کە پێتی ڕابگەیەنم...

راسپۆتین قسەی لەدەم قۆستەوەو نەیهێشت لەمە بەولاوە درێژەی پێ بدا، بە توڕەبوونەوە وتی:

– بێ دەنگ بە... ئەمەم بەیانی پێ بڵێ.

هێشتا قسەکانی تەواو نەکردبوو دەرگای لەڕووی برادەرەکەیا خڕ داخست، چونکە نەی ئەویست لەم چڵەپۆپەی خۆشبەختی‌یەدا گوێی لە دەنگی شوومی کونەبوو بگرێ، ئەو دەنگە ناسازانەی خەیاڵی خۆشبەختی ئەشڵەقێنی ئەو خۆشبەختیەی کە هەرگیز بەم جۆرەی بەخۆیەوە نەدیووە، چونکە لە هەموو ژیانیا ئەشکەنجەی وای نەچێژابوو لەڕێگای گەیشتن بە ئافرەتانی ترا، وا ئێستا لەڕێگای گەیشتن بەم ئافرەتەدا ئەیچێژی کە پڕ بە ئارەزوویەتی.

## شەوی ژوان

کاتی ژوان نزیك بووەوە، راسپۆتین بۆ چەند هەناسەیەك دوودڵی نواند .. وەك بە هەستی زکماکی خۆی پەی بەرێت بەوەی ڕاستە مەترسیەك سەرەڕۆی پێگرتووە ئەویش هەر بەو هەستە زکماکییەی کەوتە بیرکردنەوە، بەڵام لە ئەنجامدا لێکدانەوەی گەیاندیە سەر ئەوەی کە ترس و تۆقینی هەمووی لەخۆڕاییە، تەنیا قسەکانی شابانو لەگەڵ گەورەی کەنیزەکەکانی کۆشك کاری لێکردووەو لەگوێیا ئەزرنگێتەوە...

بەڵێ ڕاستە لای خزم و کەسوکاری قەیسەر خۆشەویست نیە، کە ئەمیر یۆسۆبۆف کەمترینی ئەو خزمانەیە، پاشان نەیئەزانی کە ئەمیر یۆسۆبۆف پیاوێکی سیاسییە، هەروەها ئەوەشی ئەزانی کە بە گوێرەی نەریت گراندۆقەکان ڕووبەڕوو نەبووایە هەڵمەتیان نە ئەبردە سەری، چونکە فڕوفێڵی لەپاش ملە لەوانەوە نە ئەوەشایەوە، بەوەی ئەوان بەفێزبوون بێزیان نەدەهات خۆیان نزم کەنەوە بۆ فڕوفێڵی بەتایبەتی لەگەڵ کەسێکی وەك راسپۆتین کە لە هەموو سەرێکەوە لەوان کەمتر بوو، لەوانەیە یەکێکیان بێتە وێزەی بەقامچی یا بەدار شلەکوتی مەرگی بکا، وەك چۆن (گراندۆق نیکۆلا نیکۆلافیتش) ڕاپەڕی لەڕوویا، بەڵام کوشتن، ئەویش بە بانگ کردن بۆ زیافەت بۆ شەو بەسەربردن لەماڵی یەکێکیان، شتێك بوو بەبیری کەسا نەدەهات.

بەم جۆرە راسپۆتین زاڵ بوو بەسەر ئەو ترس و لەرزەی سەرو سنگی توند کردبوو، بۆیە کەوتە خۆ گیزدان بۆ ئاهەنگەکە، خۆی ئامادە کرد بۆ ئەوپەڕی دەست وەشاندن —ئەگەر دەست وەشاندن هەبێ— کەوای دانابوو لە شەپ و تێهەڵدان تێناپەڕێ، بۆ پاشڵی قەڵەوی! بەڵام کوشتن هەرگیز بەبیری ئەوا نەئەهات کە خانەدانێ بەم کارە هەڵبسێ، هەر وەك چۆن بەبێ مێشکی دائەنا دەست بەرداربوون لەم دەرفەتە چەورە کە هیچ شتێك

نەئەگەیشتە نرخ و بایەخی، نرخی گرتنە باوەشی ئەو ئافرەتەی بەلاوە لە نرخی ئەو هەموو ئافرەتانەی بە گەورەتر ئەگرت، ئەوانەی وەك مێووپۆن وابوون لە قولی مشتیا.

دەستی کرد بە بۆن لەخۆدان و کراسێکی ئاوریشمی ڕەنگ تاریکی جوان چنراوی نایابی لەبەرخۆی کرد لەگەڵ دوولنگەیەکی ورشەدارا و جوتێ پێڵاوی چەرمی بریقەداری سوکی گرانبەهاشی کردە پێی... پاشان بۆ یەکەمجار لە هەموو ژیانیا کەوتە داهێنانی ڕدێنە چڕەکەی کە تێرو پڕ بۆنی تێهەڵسوو، ئینجا بە لەخۆبایی بوونەوە لەبەر ئاوێنە سەیری بەژن و باڵای قنج و قیتی خۆی کرد.

راسپۆتین وا نوقمە لەم وردە خەیاڵە خۆشانەدا کە لەپڕ گوێی لە لێدانی دەرگای ماڵەوە بوو، راسپۆتین دەرگای لێکردەوە، لوت و بزوت بەرەنگاری ئەمیر یۆسۆبۆف بوو هاتبوو بە ئوتومبیلە نایابەکەی هەڵی گرێ و بیبا بۆ کۆشکەکەی نیشانەی ڕێز لێنان لە پایەبەرزی راسپۆتین!

ئەو کۆشکە دیمەن شیرینە شۆڕئەبووەوە بەسەر (موهیکا)دا بەڵام باخ و باخاتی زۆری لەلایەکی ترەوە گەیشتبووە سەر ڕووباری (فۆنتانکا) وە ئەم شوێنە دوور نەبوو لە خانوەکەی راسپۆتین لە شەقامی (جۆرۆکۆفایا) بۆیە هەر بە چەند دەقیقەیە گەیشتنە دەروازەی کۆشك، ئەمیر بە کلیلێکی تایبەتی دەروازەکەی کردەوە... پاشان گەڕایەوە بەڕێزەوە راسپۆتینی خستە بەردەمی خۆیەوە بۆ چوونە ژوورەوە، کە گەیشتنە ژێر زەمینەکەیان بە پێکەنینەوە بە راسپۆتینی وت:

-سەرت سوڕ نەمێنێ ئەی باوکە کە خۆم بۆت کرد بە دەگاوان، چونکە ئەمشەو هەموو پێشخزمەتەکانی کۆشکم قاوداوە، حاڵ و ئەحواڵ وا پێویست ئەکا دووربین بین، چونکە من بەش بە حاڵی خۆم باوەڕم بەکەس نەماوە...

راسپۆتین ئەم قسانەی بۆ ئەمیر سەلماند، پاشان راسپۆتین پرسی:

- ئایا کاترینا گەیشتووە؟

- پەنجەی بۆ ئەو پالتۆ کەولانە درێژ کردکە لە ژوورێکی ژێر زەمینەکەدا هەڵواسرابوون و بە راسپۆتینی وت:

- سەیرکە ... ئەمەیان پالتۆی ئەوە...

راسپۆتین لە ئەمیی پرسی:

-کوا ئەی ئەو کوا؟

هەر لەم کاتەدا بوو کە سەماکەری شۆخ و شەنگ لەوپەڕی ژێرزەمینەکەوە تێپەڕی ئەویش بەپێی پیلانێکی دانراو، راسپۆتین ناڕەزامەندی خۆی دەربڕی و شیڕانی:

- دیسانەوە گەڕایەوە سەر ڕاکردن لەمن؟

ئەمیر بۆ ئەوەی ساردی کاتەوە پێی وت:

- ئەی باوکی پیرۆز وازی لێبێنە،چونکە کاترینا کیژێکی سرکە، خۆی بەناز ئەفرۆشێ، بە پەرۆشەوە ئارایشی خۆی داوە بۆ ئەوەی لە دانیشتنا لەبەردەستا لەوپەڕی جوانیا بێ.

پاشان دەستێکی لە راسپۆتین هەڵتەکان نیشانەی چوونە ژووری نان خواردن و وتی:

- فەرموو بچۆرە ژوورەوە ئەی باوکە، هەتا خۆمان لە شیرینیەوە بخلافێنین، هەتا لەبەرەوە میوانەکانمان دێن بۆ ئەم ئاهەنگە شەونخونیە بێ وێنەیەمان.

لە ڕاستیا پێکە پڕ لە شەمپانیاکان کە پێشتر پڕکرابوون لەلایەن ئەمیر یۆسۆبۆف خۆیەوە بە یارمەتی هاوبەشەکانی لە پیلانەکەیا ئامادە کرابوون، ئەمیر خۆی ئەیزانی ئەو پێکانەی لەلای ڕاستەوە ڕیزکراوون (سیانۆری پۆتاسیۆم)ی تێکەڵ کراوە، کە ژەهرێکی کوشندەی دەم و

دەستی یە، کاتی خۆی گورنگ خۆی بەم ژەهرە دەرمان خوارد کرد.

پیلانگێڕکان ئەم ژەهرەیان تاقی کردبووەوە بەوەی دەرخواردی سەگێکیان دابوو هەر لە چەند هەناسەیەکی کەما تۆپانبووی و لاشەکەشیان لە باخەکەدا فڕێ دابوو.

جگە لەو پێکی شەمپانیا ژەهراویانە هەندێ گاڵگاڵی و ناسکەنان دانرابوو، هێندێکیان ڕەمگیان سوور و هێندێکیان سپی بوو، هەویری گاڵگاڵییە سورەکان بە ژەهراوی کوشندە گیرابووەوە، بەڵام سپییەکان بێ وەی بوون.

لەوکاتەوە کە ئەمیر لە ماڵی خۆیان دەرچوو هەتا قەشە راسپۆتین لەتەك خۆیا بێنێ، پیلانگێڕەکان لە یەکێ لە ژوورەکانی نهۆمی سەرەوەی کۆشکەکەدا خۆیان شاردبووەوە، چاوەڕوانی جێبەجێ کردنی کارەساتەکە بوون، لە ئافرەتان جگە لە (کاترینا) کە بۆ (ڕاوکە) دانرابوو، لە دەستە خوشکەکانی ئەو دووان لە سەرەڕۆکانیان لەتەکیا هەتبوون، پێشڕەوی ئەم پیلان گێڕانە نوێنەر (بۆریشکیفتش) و (گراندۆق دیمیتری بافلۆفتش) بوون کە بەتەواوی و ڕاستی تینوی تۆڵەسەندن بوون، بە گیان کێشانی ئەو ناپاکە..

## پێك لێدان

ئەمیر و راسپۆتین بەجووتە چوونە ژووری نان خواردنەوە، بە واتەیەکی تـر (ژووری خنکانـدن) کـە پێکـەوە دانیشـتن، یۆسـۆبۆف بـە ڕوویـەکی خۆشەوە وتی:

– وا دیـارە میوانـەکانمان بـەر لـە خۆمـان گەیشـتوون، وا بۆخۆیـان ڕائەبوێرن، خۆزگە خۆیان لە ئێمە نزیك ئەکردەوە....

ئا لەم کاتەدا ئاوازی مۆسیقایەکی خۆش گەیشتە بەر گوێیان، بەوەی نوێنـەر (پۆرپشـکیفتش) قـەوانێکی لەسـەر گرامـە فۆنەکـە دانـابوو، بـەو نیـازەی هـەر دوو دڵیـەك لـە دڵ و دەروون و مێشـکی راسـپۆتینا هـەبوو هـەمووی برەوێننـەوە، بیسـڕنەوە، بەمـە راسـپۆتین کەوتـە پێکـەنین و گەشایەوە و خۆی گیزدا بۆ بەشداربوون لە ئاهەنگێکی پڕ لە ڕابواردنی بەربەرەڵایدا، بۆیە وتی:

– وا دیارە شەوێکی خۆش بەزم و ڕەزم ئەبەینە سەر....

بۆ ئەوەی ئەمیر یۆسۆبۆف بە قسەی قوت قوتی خۆش گێژو حۆڵ بکا و رایکێشێ بۆ ناو ئەو داوەی بۆی نراوەتەوە، هەتا توانی قسەی گەپاوی پەردە لەڕوو داماڵراوی ڕابواردنی بۆ ئەگێڕایەوە، کە ئەمیر بەتەواوی دڵنیا بـوو بـەوەی هـەتا گوێچکەکانیشـی نـوقم بـووە لـە شـەپۆلی قسـە هەلـەق و مەلەقـەکانیا، بـەگورجی پێکێکـی ژەهـراوی دا بەدەسـت تەشـریفی ناموبارەکەیەوە، بە چالاکیەکی تەواو ساکارانەوە، ئەمیر خۆشی پێکێکی بە دەستەوە گرت، لەو پێکانەی دڵنیا بوو هیچی تیا نیە، داوای لە قەشە کـرد کـە بەجووتـە پێـك لێبـدەن لەسـەر نـەریتی دۆسـتایەتی لـە خواردنەوەدا...

پێك لەیەك درا.... بەڵام راسپۆتین هەر بە سروشت ڕێویەك بوو کارامە و بـەفڕوفێڵ، هـەر لـەو دەرفەتـە بچـکۆلەیەی ئـەمیر کـەمێك ڕووی خـۆی

وەرچەرخان، ئەو بە سوك دەستییەکی بێ وێنەوە، ئەوەی لە پێکەکەدا بوو ڕشتییە سۆپەکەی نزیکییەوە ئەمەشی لەڕووی زرنگی و هۆشیارییەوە کە زیانێکی تیا نیە، نەوەکا ئەمە هەڵەیەك هەبێ لەکایەدا.

لەگەڵ ئەم سووك دەستیەشیا دەم و لەوسی خۆی سڕیەوە، وەك ڕاست بکا پێکەکەی خواردبێتەوە، وە بە زەردەخەنەیەکەوە وتی:

– بەخوا ئەم خواردنەوەیەمان گەلێ خۆشە! تامێکی خۆش و زەوقێکی بەرزی بێ وێنەی هەیە!

ئەمیر ئاگاداری ئەو سوك دەستیەی ئەو نەبوو، دڵنیا بوو لەوەی شەرابە ژەهراویەکەی خواردۆتەوە، پاشان هەر سەرنجی ئەم گیانلەبەرە سەیرەی ئەدا، کەوا پێکی شەرابی ژەهراوی وای خۆردۆتەوە فیلێك لە دە هەناسەدا ئەکوژێ، کەچی ئەو وەك ئاوی پرتەقاڵی پالاوتەی نابێ بەسەریەوە! هیچ نیشانەیەکی ئازارو شەکەتی لێ دیاری نەدا، ئایا ئەبێ ئەم قەشە چەپەڵە ڕاست بێ توانایەکی لەڕادەبەدەری هەبێ وەك خۆی لاف و گەزافی پێوە لێئەدا؟

ئایا ئەو توانا لە ڕادەبەدەرەی لە یەزدانەوەیە یا شەیتان بۆتە پاڵپشتی ئەمیر ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا، چۆکەکانی لەبەر لەرزین لەیەکیان ئەدا، هەموو لەشی نیشتە سەر ئارەقە دەردان، ئەم تێکچوونەی ئەمیر سەرنجی پیرە قەشەی ڕاکێشا، چاوەکانی بڕیە دوو چاوی وەك گاڵتەی پێبکا، قەشە دڵی لە ئاستیا کرمێ بوو بوو، بۆیە پێی وت:

– ئایا پێکت لێ تێکچووە؟

ئەمیر وای دانا کە پیلانەکەیان کەوتۆتە ڕوو، دەسە پاچە دۆش داما، نەی ئەزانی چی بڵێ.... کاری ڕاسپۆتین ڕاست بێ کە لەم قۆرتەی دەرهێنا بوو بەوەی وتی:

– ئەی کوا کاترینا بۆچی نەهات؟

- ئەی باوکی بەڕێزم هەر ئێستا ئەچم لەگەڵ خۆم ئەیهێنم....
ئیتر ئەمیر لە ژوورەکە دەرچوو بە هەنسکە بڕکێ، بە پلیکانەکانا سەر کەوتە سەرەوە، کە گەیشتە لای برادەرەکانی، قیڕانی وتی:
- بمگەنێ، فریام کەون! هەتا ژەهریش هیچ کاری لەم بەچکە شەیتانە نەکرد... کەوابوو ئەبێ چی بکەین؟
ترسێکی بێ پایان لە پیلانگێڕەکان نیشت، وا لە دڵیان چەسپی کە راسپۆتین لە قوڕی ئادەمیزاد دروست نەکراوە، لە بێمێشکیانەوە کە بەدوای کوشتنیا وێڵن.
ئافرەتەکانیش خۆیان خزانە قوژبنێکی ژوورەکەوە، لەترسا چۆقە چۆقی دانیان ئەهات، لێرەدا ئەمیر یۆسۆبۆف تینی دایە بەرخۆی و وتی:
- وا ئێستا چەکێکی تازە بەکارئەهێنم بۆ لەناوبردنی، هەتا بزانم ئەم جادووگەرە بەرگەی تەقەمەنیش ئەگرێ؟
پاشان دەمانچەیەکی گەورە دەرهێناو گەڕایەوە ژووری نان خواردنەکەیان، کە گەیشتە ژوورەکە لە دەرگاوە سەیرێکی ناو ژوورەکەی کرد، دی وا ڕاوەستاوە لەسەرخۆ سەیری ئەو مۆمدانە ئەکا کە بەدیوارەکەدا هەڵواسراوە، چرایەکی نیوداشی ڕوسی ڕوناکی کردۆتەوە، راسپۆتین لە ڕاوەستانەکەیا پشتی کردبووە دەرگاکە، ئەمیر یۆسۆبۆف بە هەنگاوی بێدەنگی لێی چووە پێشەوە، لە دڵەوە لەخوا پاڕایەوە کە پشتیوان و یارمەتیدەری بێ لەم کردەوەیەیدا، پاشان پشتی راسپۆتینی کردە نیشانگاو تەقەی لە دەمانچەکەی دەستی هەڵساند... گوللە لەشی کوناودەر کرد، لەسنگییەوە دەرچوو لە پارچە کەلوپەلێکی ژوورەکەدا گیرسایەوە، لەپاش قەیرێ لارەولار کردن بە پشتا بەربووەوە، دەستەکانی ڕاستەو چەپ کەوتنە سەر یەك، دەمی کەوتە کەف چنین و دەموچاوی تاریك داگیرسا، بەتەواوی گرژبوو، پاشان خاوبووەوە لەسەر زەوی

ژوورەکە لاڵوپاڵ درێژبوو.

کە ئەمیر یۆسۆبۆف ئەمەی دی، نەعرەتەیەکی خۆشی و دڵسۆزی ایدا:

– جادووی جادووگەرمان شکاند، وا ئەمجارە مرد، ئەوەی بە ژەهر نەمرێ بە گوللە گیانی ئەکێشین!

هەموو شتێك نیشانەی مردنی یەك جاری راسپۆتینی ئەگەیان.

ئەمیر بۆ چەند هەناسەیەك ڕاوەستا، سەرنجی دایە ئەو قەڵافەتە گەورەیەی پڕ لە تەوژم و تینی دۆزەخی بوو کە بەتەنیا بەرگەی لەشکرێك ئەگرێ، وا ئێستا درێژبووە لەسەر زەوی، ئەم درێژبوونەی ئەوەندەی تری زەبەلاح کردبوو، پاشان ئەمیر کەوتە منجە منج:

– پەنا بەخوا لەم کەڵە پیاوە زل و زەبەلاحە، ناهەقی ژنان ناگرم کە شێت و شەیدای بوون.

پاشان ئەمیر لە ژووری نانخواردنەکە دەرچوو.... ڕووی کردە لای برادەرەکانی هەتا موژدەی مەرگی راسپۆتینیان بداتێ – پاش ئەوەی گوێیان لە دەنگی گوللەکە بوو– ئەوە بوو تیری قورەت پێکای و لە ئەنجاما خوا سەرکەوتنی بۆ ڕوسیا نوسی..

## سەرەمەرگ

پـیلان گێڕەکـان ئاهێکیـان تـێ گەڕایـەوە، وردە وردە هاتنـە سـەرخۆ، کەوتنە ماچ و موچ و گەردن ئازادی لەیەکتری، بەهۆی ئـەم سەرکەوتنە بێ وێنەیەوە کە وا چاوەڕێی نە ئەکرا، لێرەدا گراندۆق دیمتری بافلۆفتش بە ئەمیر یۆسۆبۆفی وت:

– سوپاسـی بـێ پایـان بـۆ یـەزدانی گـەورە ئـەی بـرای شـیرینم، کـەوا پشـتگیری کـردین و سـەی خسـتین، بـە ڕزگـاربوون لـەم داوێـن پیسـە کـە بنەماڵەکـەمانی لەکـەدار کردبـوو. نوێنـەر (بۆریشـکیفتش) بـە دەنگێکـی ناقولاوە وتی:

– ئاپاکی لەگەڵ نیشتمان ئەنواند، لە دواوەو لە ژێرەوە خـەریکی پشت شـکاندنی بـوو. بـەڵام (کاترینـا) کـە یـەك پارچـە بـوو بـووە ئـاگر، ئـەم پرسیارەی لێکردن:

– ئایا ئێوە لەو باوەڕەدان کە مرد؟

نوێنـەر (بۆریشـکیفتش) پرسـیارەکەی ئـەوی دوپـات کـردەوە، بـەوەی وتی:

– ئەرێ بەڕاست... میرم تۆ لەو باوەڕەدای کە مرد؟

بەگورجی سـەماکەرە شـۆخ و شـەنگەکە لەترسا کەوتـە هەلەکـە سـەما، بەجۆرێ هەڵئەلەرزی چۆقە چۆقی دانی ئەهات، لەتاو دەمـار تـورت بـوونی قیژانی:

– گوێ ڕاگرن ... گوێ ڕاگرن، وا هەست ئەکەم گوێم لە دەنگێکەوەیە لـە نهۆمی خـوارەوە کـە بەباشـی هـەموویان گوێیـان شـل کـرد، هەسـتیان بـە دەنگی کرد لـە ژووری نـان خواردنەکـەیان، ئـەم دەنگـە وەك چەخماخەیەك لێیان بدا، هەموویان هەر ئەوە نـەبوون لـەهۆش خۆیـان بچن، لێرەدا ئەمیر کەوتە منجە منج:

– بەراستی ئەمە جێگای سەرسوڕمانە! ئەوە گیانی ئەو بەنەفرەت کراوەیە هەر لە ئێستاوە دەورو خولی کۆشکەکە ئەدا!

پاشان بەگورجی کەوتنە خۆیان، وەك هەستێکی سەیری تۆقێنەر پاڵیان پێوە بنێ، پوویان کردە ژووری نان خواردن کە وا دانرابوو راسپۆتین تیایا درێژبووە، کە گەیشتنە بەردەم ژوورەکە، دیان دەرگای ژوورەکە بەتوندی ئەکرێتەوە، کاتێکیان بەخۆیان زانی وا – راسپۆتین بە گۆشت و خوێنیەوە بەرەو پیریان دێت، چاوەکانی ئاگری خەشم و قینی لێ ئەبارێ، بە تەواوی هەڵچوو بوو، هەتا ئەهات لێیان نزیك ئەبووەوە، خوێن بە ڕیشە پانەکەیا ئەچۆڕایەوە، چاوەکانی ئەبڵەق بووبوون، وەك دێوێکی سامناکی لێهاتبوو.

پیرە قەشە بە دەنگێکی گڕی قەبەوە وتی:

– کەوابوو نیازتان کوشتنم بوو؟ بەڵام ئاسمان ڕێتان بۆ بەرەڵا ناکا، گرفتاری گەورەترین سزایەك ئەبن.

پاشان خۆی کردەوە دەستە خوێناویەکانی بەرەو ئاسمان بڵند کردەوە، وەك نەفرەتیان بۆ بهێنێتە خوارەوە!

لێرەدا ترس و تۆقینی پیلان گێڕەکان گەیشتە ڕادەیەك خۆیان پێ ڕانەگیرا هەڵهاتن و ئافرەتەکان زریکەی ترسیان بەرزبووەوە، وەك بەرەنگاری ئاگری بووبن بیەوێ کۆشکەکە هەڵ لوشێ، کە راسپۆتین ئەمەی دی دایە قاقای پێکەنین و نەعرەتەی بەسەرا لێدان:

– ئەزانم چۆن تۆڵەتان لێ ئەسێنم....

ئیتر لەسەرخۆ ڕووی کردە دەرگای دەرەوە (دەروازەی کۆشکەکە) وا پیلانگێڕەکانیش زەقەی چاویان دێ و سەیر ئەکەن و قوڕ و قەپیان لێ کردووە زمانیان بەسراوە ناوێرن لە پێستی خۆیانا بجوڵێنەوە، ئیتر زۆری نەخایاند لەچاو بزربوو، پاش ئەوەی لە پێپلیکەی کۆشك هاتە خوارەوە

بۆ باخە گەورەکە..

کەوابوو ئەم جانەوەرە گوللەش کاری لێ نەکرد، وەك هێزێکی لەڕادەبەدەر بیپارێزێ، ئێمە لەکار نەکردنی ژەهرەکەمان زانی، بەوەی ڕشتیەیە ناو سۆپەکەوە کە لە نزیکیەوە بوو، بەڵام نەمردنی بە گوللە بەچی پینە بکەین، مەگەر بەوەی کە لەش و لاری تۆکمە و داڕێژراوە و پڕە لە تەوژم و توانای زیندەگی و ژیان؟!

پیلانگێڕەکانیش دیسان هەر کەوتبوونە ژێر کاری پڕۆپاگەندەی جادووگەری راسپۆتین و هێزی موگناتیسی چاوەکانی، لەو باوەڕە نزیك بووبوونەوە کە لە ڕادەبەدەر و لە قوڕی ئادەمیزاد دروست نەبووە، جنۆکە پارێزگاری لێ ئەکەن، هەتا لەوانەیە پارێزگەرەکانیشی فریشتە بن....

نووزە لێبڕان

راسپۆتین گەیشتە خواری پێپلیکانەکان و کەوتە ڕۆیشتن بەو باریکە ڕێگەیەدا کە لە باخچەکەوە ئەچێ بۆلای دەروەازەی دەرەوە، لێرەدا یەکێ لە پیلانگێڕەکان بە ئاگا هاتەوە -ئەویش نوێنەر (بۆریشکیفتش) بوو بەوەی ئەگەر ئەم چەپەڵە ڕزگاربێ ئەبێ چ ئاگرێك هەڵگیرسێنێ هەتا وشك و تەڕی خەڵکی بەسەر یەکا بکا بە خۆڵەمێش، بەتایبەتی ئازادی خواهان، بۆیە بە هەموو دەنگیەوە وتی:

-خوا ئاگاداربێ....! خوا لە دایکی خۆمم بسێنێ ئەگەر بیەڵم ئەو بەچکە شەیتانە لەچنگم قوتاربێ.

ئیتر دوای کەوت، دەمانچەیەکی گەورەی بەدەستەوە بوو، نزیك بە باریکە ڕێگەکە گرتیەوە چاپوکانە گوللەیەکی نا بە پشت ملیەوە، یەکسەر راسپۆتین بەر بووەوە بۆ سەر زەویەکە وەك گا بەردێك بێدەنگ بوو، بەڵام بۆریشکیفتش بەبان سەریەوە ڕاوەستا، وا دەمانچەکەشی هەر لە قلی مشتیایە، چاوەڕوانی ئەوەیە هەر بجوڵێتەوە گوللەی تری بکا بەگژا،

چونکە وا بە ئاسانی پێی نەئەسەلما کە ئەم جادووگەرە لە حەوت ساڵان ڕاست بۆتەوە.

ئیتر پیلانگێڕەکانی تریش بە دەمانچەی ڕووتەوە چواردەوری تەرمی ڕاسپۆتینیان گرت وا لالە ڕاسپۆتین لەگەڵ مرخە مرخیا خوێناو بە لغاوەیا ئەچۆڕێتەوە، ئەم مرخە مرخەی کشوماتی ئەو شەوە بێ گەردەی ئەشێوان، ئافرەتەکانیش وا لەسەر پێپلیکانەکان لەترسانا هەڵ ئەلەرزن و سەیری ئەم دیمەنە سامناکە ئەکەن.

ئا لەم کاتەدا بوو کە گوێیان لە وڕەی ئوتومبیلێ بوو لە بەردەمی دەروازەی باخچەکەدا ڕاوەستا، ئەم ئوتومبیلە (دکتۆر لازارنسکی) هێنا بوو کەخۆی ئەندامێکی ئەم پیلانە بوو، هەتا ئوتومبیل چیەکەشی دیسان پیاوێکی دڵسۆزی باوەڕ پێکراو بوو. هاتنی ئەم پزیشکە لەسەر ڕێکەوتنێکی تایبەتی بوو، هەتا لە مردنی ڕاسپۆتینیان دڵنیا بکا، ئیتر ئوتومبیل چیەکە بە چرای چاوێکی ئوتومبیلەکەی شوێنەکەی بۆ ڕووناک کردنەوە، پزیشکەکەش شۆڕبووەوە بەسەر تەرمەکەی ڕاسپۆتینا کە ئێستا مرخە مرخەکەی جارانیشی لەبەر بڕاوە، لەپاش پشکنینێکی زۆر ورد ڕاست بووەوە و وتی:

– ڕاسپۆتین بەتەواوی مردووە، واتە لە مۆتەکە ڕزگارمان بوو!

بەڵام پیلانگێڕەکان، کە هەموو بە دووچاوی سەری خۆیان کارەساتی لەو شێوەیان دی بوو، پێیان وتەوە:

– ئایا بەتەواوی دڵنیای لە مردنی ئەی دکتۆر؟

پاشان هەموویان تێ وڕوکان وە هەرچیەکی سەیریان دیبوو بەر لە هاتنی لەو شتانەی بە مێشکا جێگای نابێتەوە، هەموویان بۆ گێڕایەوە، لە وەڵامیانا پزیشك وتی:

– بەڵام من هەمووتان دڵنیا ئەکەم کە هەرگیز جارێکی تر ڕاسپۆتین

ناگەڕێتەوە ژیان بەهیچ جۆرێ.

لێرەدا کاترینا بەرگی ترسنۆکی لەخۆی فرێ دا و لە پێپلیکانەکان هاتە خوارێ و لە پیاوەکان نزیك بووەوە و بە پزیشکی وت:

- ئەی دکتۆر ئەوەی ئێوە ئەیڵێن لەوانەیە ساویلکە بیسەلمێنێ، ئێمە بۆ راسپۆتین هەرچی لەڕادەبەدەریش بێ بەلامانەوە گونجاوە و ئەگونجێ.

لێرەدا نوێنەر (بۆریشکیفتش) گوللەیەکی تری نا بە کاژەڵاکی سەریەوە، کاسەی سەری کوناودەر کرد، ئەویش بۆ ئەوەی بەتەواوی دڵیان ئاو بخواتەوە، وە ئەمیر یۆسۆبۆف بە پێڵاوەکانیەوە ئەیکێشا بە کەللە سەریا و ئەم قسەیەی ئەوت و ئەوتەوە:

- ئەگەر ویستت دڵنیا بی لە تۆپینی مارێکی ژەهراوی کوشندە، جارێ سەری پان کەرەوە، کە لەسەر پان کردنەوەی بوونەوە، کاتێکیان بە خۆزانی وا باڵبازێ، کە گوێی لە تەقەکان بووبوو، هاتبوو بزانێ چی ڕوویداوە، بۆیە نوێنەر (بۆریشکیفتش) لاشەی گەماڵە پیرە کوژراوەکەی کە دەرمان خواردیان کردبوو پیشاندا و بە باڵبازەکەی وت:

- ئەم سەگەم کوشت چونکە منداڵ و نۆکەرەکانی کۆشکی هەراسان کردبوو.

لەگەڵ ئەم قسانەیدا دەستی درێژکرد کاغەزێکی چەند رۆیڵی خستە ناو قوڵی مستیەوە، ئیتر باڵبازەکە بە گورجی بۆی دەرچوو.. بەمە ئاهێك لە دڵی پیلانگێڕەکان گەڕاو ئیتر کەوتنە خۆیان بۆ سەر نگوون کردنی تەرمی راسپۆتین...

ئەمیر یۆسۆبۆف تەرمەکەی راسپۆتینی هەڵگرت و خستیە ئوتومبیلەکەوە، پاشان لەگەڵ نوێنەر (بۆریشکیفتش) سواری ئوتومبیلەکە بوون، نوێنەری ناوبراو بە دەمانچەی ڕووتەوە لەسەر تەرمەکە یاساوڵ بوو هەتا نەوەکاو گیان بگەڕێتەوە ناو لاشەکەی!

بەم جۆرە راسپۆتین چووە دوا سەیرانی، لە تاریکی ئەو شەوەدا، بەوەی ئوتومبیلەکە بەوپەڕی تیژیەوە وەك تێسکە تێپەڕی بە شەقامە چۆڵ و هۆڵەکانا، هەتا لە ڕووباری (نیڤا) پەڕینەوە، گەیشتنە ناوچەی دۆرگە ورد و پەرت و بڵاوەکان، لەوێشەوە بەرەو سەر پردی (بترۆفسکی) سەرکەوتن، ئەو پردەی لەسەر ڕووباری (نیڤا)ی بچووك دروست کراوە، کە ئوتومبیلەکە گەیشتە ناوەندی پردەکە، لەپڕ ڕاوەستا، بەر لە هەموویان ئەمیر یۆسۆبۆف لە ئوتومبیلەکە هاتە خوارێ و لە مەحەجەرەی پردەکەوە سەیرێکی خوارەوەی کرد.

شتێکی سەیر بوو کە ئەمیر ئەوەندە لە ڕووبارەکە وردبووەوە، چونکە ئاوی ڕووبارەکە بەستبووی بێگومان ڕێگای هاتوچۆی کەشتی لە هیچ کونێکەوە نەبوو. لەبەرئەوە لەم ڕووەوە مەترسی نەبوو، کەوابوو بۆیە ورد ئەبووەوە چونکە هاوکارەکانی لەم پیلانەدا پێیان وتبوو کە خەڵکەکە لە شوێنێکەوە سەهۆڵەکەیان شکاندبوو بۆ ئەوەی ئاوی لێوەبەرن بۆ پێویستی خۆیان، وەکو ئاو وەرگرتن بۆ جلشتن.

ئاوی ئەو شوێنە شکاوە لەسەر پردەکەوە ڕەشی ئەکردەوە بەوەی ئەو بەفرە زۆرەی ئابلۆقەی دەمی شوێنەکەی داوە کە بەفرەکە بەڕەنگ وەکو چوڕی شیرە ئەو شوێنە چاکترین شوێنێکە دەست ئەدا بکرێ بە گۆڕی تەرمی ئەم قەشە چەپەڵە.

ئەمیر یۆسۆبۆف گەڕایەوە لای ئوتومبیلەکە، کە نوێنەر (بۆریشکیفتش) چاوەڕوانی ئەکرد بەوپەڕی بێدەنگییەوە، پێی وت کە شوێنەکە باشە. پاشان بە یارمەتی ئوتومبیل چیەکە لاشەکەیان هەڵگرت و بەرزیان کردەوە بۆسەر محەجەرە کە لەوێشەوە توڕیان هەڵدایە خوارەوە.

هەرسێکیان هەستیان کرد بە گرانی تەرمەکە، ئەگەر چی هەرسێکیان زۆر بەهێز بوون، لەژێریا بەتەواوی شەکەت و ماندووبوون، لەوانەشە

ترس و تۆقێنی کردەوەو شوێنەکەیان بەو دەردەی بردبن ئەگەر چی لە ڕاستیا کابرا خۆی پیاوێکی زل و زەبەلاح بوو بێگومان ئەم جۆرە پیاوانە سەنگ و گرانیەکی تایبەتیان ئەبێ لە مردنیشا.

بەربوونەوەی تەرمەکە بۆناو ئاوە سەرهەڵگیراوەکە شڵپەیەکی گەورەی لە ئاوەکە هەڵسان، هەروەك چۆن پریشکی کەفاوی لە ئاوەکە بڵند بووەوە.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشا زۆری نەخایاند ئاوەکە هاتەوە دۆخی جارانی وەك هەر هیچ شتێك ڕووی نەدابێت.

ئەمیرو نوێنەرەکە کەمێك ڕاوەستان، سەیری ئەو دەمار ڕەشە کراوەیەی ئاوەکەیان ئەکرد کەچۆن شەیتانی ڕوسیای هەڵ لوشی، هەستی دڵ و دەروونیان وای پێ ئەوتن کە زۆر ناخایانێ لەناو ئەو شەختە سەهۆڵ بەندانەدا سەر هەڵئەدا و ئەژێتەوە، یا لە ناکاوێکا لە تەنیشتیانەوە سەر دەر ئەهێنێ و ڕائەوەستێ بەڕێگەیەکی تایبەتی لەڕادەبەرەدەی ئەوتۆ کە ئەمان سەرو بەری لێ دەرناکەن.

ڕەشابەکە پەیتا پەیتا پیچە کڵۆی بەفری ئەکرد بەگژیانا، کەچی ئەوان چۆڕە چۆڕ ئارەقە بەلەشیانا ئەهاتە خوارێ، بەهۆی شپرزەیی و سەر لێشێواویانەوە، پاشان (بۆریشکیفتش) لە قوڵایی دەروونیەوە بە پەستیەکەوە وتی:

– لە ئەنجاما راسپۆتین مرد، بەڵام گیانی نەگریسی هێشتا زیندووە، بەرۆکی خەڵکی بەر نادا هەتا بەتەواوی سەریان نەخواو دووچاری کارەساتێکی گەورەیان نەکا.

ئەمیر بە دەنگێکی نوساوەوە وەڵامی دایەوە:

– بەڵام ئەوەی لە توانامانا بوو بەبێ درێغی بەختمان کرد لەپێناوی ڕزگارکردنی نیشتمانی خۆشەویستمانا لەو کارەساتە پڕ مەترسیەی ئەم نەگریسەو تاقمەکەی ئەیان ویست هەڵی دەنە ناوی بەنیازی لەناوبردنی... هەموو شتێکیش ئەگەڕێتەوە بۆلای خوا...

ئەریّ بەڕاستی مرد؟

بەیانی لەناو خەڵکا دەنگی دایەوە کە (راسپۆتین) مرد، بەڵام کەس سەرچاوەی ئەم هەواڵەی نەئەزانی لە کوێوەیە...

کاری ئەم هەواڵە بەلای خەڵکەوە وەك یەك نەبوو، ئەوەبوو شابانو لەترسا هەروەك شێتی لێهات، هەروەها وەزیری ناوخۆ برۆتۆبۆبۆف لەترسانا جێی بەخۆی نەئەگرت، بەڵام دوژمنەکانی بەتەواوی دڵیان ئاوی خواردەوە، ژنە گیانیەکانی هەستیان بە بێوەژنی و لێوبەباری کرد بەوەی تازە کێ باریان ڕاست ئەکاتەوە، لەکوێ راسپۆتینێکی تریان چنگ ئەکەوێ؟

هێزی باڵبازی نهێنی و ئاشکرا کەوتنە جموجوڵو گەڕان بەدوای (پیاو چاکا) هەر خوا خوای نوکە قسەیەکیان بوو دەستیان کەوێ بەڵام بێ هوودە بوو، ژمارەی گیراوەکان ڕوو لە بەرزبوونەوە بوو، ئەمەش بەو نیازەی شتێك هەڵکرێنن دەربارەی سەرو شوێنی تیاچووی، ئەوەی دەست ئەوان کەوت هەر ئەوە بوو کە دواجار بە زیندوێتی دیویانە بەر لە چوونی بۆ کۆشکی ئەمیر یۆسۆبۆف بە میوانی چووە بۆ دیدەنی گراندۆق دیمتری پافلۆفش و نوێنەر (بۆریشکیفتش) بۆ شەو بەسەر بردن.

ئەگەرچی قەیسەر خۆی لە پترس بورگ نەبوو بەوەی لە کۆڕی جەنگا بوو، لەگەڵ ئەوەشا شابانو ئەلکسندەرا فەرمانی دەرکرد بە گرتنی مێردی کچە خوشکی قەیسەر ئەمیر یۆسۆبۆبۆف هەروەها بۆ گرتنی گراندۆق دیمیتری بافلۆفتش کە کوڕە مامی قەیسەر بوو، بەڵام نەیوێرا نوێنەر بۆریشکیفتش بگرێ بەبەڵگەی گەورە، بەوەی پایەی نوێنەری لە ڕۆمادا پاراستبووی وە لەهەمان کاتیشا پاسەوانی تایبەتی خۆی هەبوو لەوانەی ئامادەبوون بمرن لەپێناویا.

ئەم هەواڵە بە بێتەل دا بە قەیسەر گەیەنرا، ئەویش بەگورجی گەڕایەوە

لەتەك گراندۆق بۆڵ کە مامی قەیسەر بوو لە هەمان کاتیشا باوکی گراندۆق دیمتری بوو کە یەکێ بوو لە گیراوەکان.

مامی قەیسەر زۆری بە قەیسەر وت هەروەك هەموو ئەندامانی بنەماڵەی تێکەوتبوون بۆ پەرەلاکردنی گراندۆقی ناوبراو، بەوەی هیچی لەسەر ساخ نەبۆتەوە، بەلام ئەو هەموو پاڕانەوەو تکایانەیان بەکەڵك نەهات، قەیسەر هەر دووری خستەوە بۆ ئێران، بەلام ئەمیر یۆسۆبۆف دوورخرایەوە بۆ سەر زەویەکانی لەلادێ.

دوورخستنەوەی ئەم دوو پیاوە ئەنجامەکەی بە هەڵهاتن هات، بەوەی ڕوویان کردە ئەورووپای ڕۆژئاوا لەدوای شۆڕشی (ئۆکتۆبەر)، بەلام گراندۆق بۆڵ باوکی گراندۆق دیمتری و گراندۆق نیکۆلا ئەوەی بە قامچی هاتە ویژەی راسپۆتین لە بارەگای سەرکردایەتی سوپا، دوای شۆڕش کۆمۆنیستەکان بە خنکاندن لە مۆسکۆ لەناویان بردن، ئەگەرچی مەکسیم گۆرکی نوسەری گەورە و بەناوبانگی ڕووی بۆی تێکەوت، بەوەی ڕابوردووی نیشتمان پەروەر بووە لەدژی راسپۆتین، بە شێوەیەکی ڕەسمی فەرمانی لێخۆش بوونی بۆ دەرچوو، لەهەمان کاتیشا فەرمانی خنکاندنیان بۆ دەرکرد ئیتر بە کوتوپڕی ملیان بە شمشێر پەڕاند.

دوورخستنەوەی ئەو دوو خانەدانە لەلایەن قەیسەرەوە ئەوپەڕی گەردن کەچی بوو بۆ ژنەکەی هەتا دوای کۆچی راسپۆتینیش.

بێگومان کۆمەڵەی لایەنگرانی ئەڵمان لەناوچوونی راسپۆتینیان لەلاوە گران بوو، ئەگەرچی پەژارەو دڵتەنگی شابانو هەمووی لەبەر دەمار شلی بوو چونکە وای دانابوو ژیانی جێنشین و بنەماڵەکەی پەیوەندی بە ژیان و نەمانی راسپۆتینەوە هەیە.

بەلام کۆمەڵەی ئەڵمان و لایەنگرەکانی بۆیە دڵتەنگ بوون چونکە راسپۆتین هۆی تێك شکاندنی هێرشی برۆسیلۆف و پاشان

خۆبەدەستەوەدانی ڕۆمانیا بوو بە ئەڵمان، هەروەها هێندەی نەمابوو قەیسەریش بخوسێنێ و بیخاتە سەر ڕێگەی مۆرکردنی ڕێکەوتنی دوو قۆڵی بۆ گرێدانی پەیمانی ئاشت بوونەوە لەنێوان ڕوس و ئەڵمانا، هەتا ئەڵمان سەری بپەرژێ لە ڕووی دوژمنە ڕۆژئاواییەکانیا ڕاوەستێ نەك لە دوولاوە جەنگ بکا.

هەروەها سەرۆك وەزیران برۆتۆبۆبۆف -کە دوای شتۆمەر دانرا، لە هەموو کەسێك توندتر بوو لەسەری چونکە برادەرو شاگردی بەردەستی راسپۆتین بوو، لەگەڵ ئەوەشا ئەوەندە لە قەیسەر نزیك بووبووەوە بە تەواوی بووبووە سێبەری قەیسەر بەو نیازەی جێگەی گۆڕبەگۆڕەکەی بگرێتەوە!

پەلەقاژە کردنی لەم ڕووەوە لەسنور بەدەر بوو، دەستی کردبوو بەوەی کە گوایا ئەتوانێ گیان بگێڕێتەوە، ئەی وت:

- گیانی (ڕەحمەتیەکە) کراوەتە بەر من.

خۆی کردبووە ڕابەر لە نێوان گیانی راسپۆتین و شابانودا، بەوەی ئەتوانێ گیانی راسپۆتین بدوێنێ و قسەی شابانوی پێ ڕاگەیێنێ!

ئەم جۆرە نوقڵانەکەی نوێنەر بۆریشکیفتش هاتە دی کە ئەیوت راسپۆتین نەمردووە چونکە لەناو دڵ و دەروونی شاگرد و قوتابیەکانیا ئەژی، بەوەی جێی خۆی کردۆتەوە لە دوو توێی مێشکیانا و گیانی راسپۆتین بە دەوریشتی کۆشکی قەیسەریدا ئەخولێتەوە هەتا حاڵ و ئەحواڵیان بەمەرە ئەگەیێنێ و ئەیانبا بە ناخی ئەرزا.

**ئەی تەرمی پیاوچاك كوا؟**

هەركەسە قسەیەكی لەسەر ئەكرد... بەتایبەتی كە ئەمیر یۆسۆبۆف و گراندۆق دیمتری نەچوونە ژێرباری ئەوەی كە ئەوان كوشتوویانە.... هەتا ڕۆژێكیان، ژنێك لەو ژنانەی بۆ جل شتن ئەچێتە سەر چالآوێ لەو چالآوانەی بەفرەكەیان بۆ شكاندووە لە ڕۆخ جۆگایەكی گەورە لە ناوچەیەك لە ناوچەكانا، ژنە دەستی بەر لاشەی راسپۆتین ئەكەوێ كە خوڕی ئاوەی ڕووبارەكە گەیاندبوویە ئەو شوێنە.

هەواڵ گەیشتە باڵباز و هاتن لاشەكەیان لە ئاوەكە دەرهانی، كە پزیشك ئۆقڵەمەی كرد، بۆی دەركەوت بەهۆی چەند گوللەیەكی دەمانچەوە مردووە بەر لە خنكاندنی، بەلآم چۆنێتی لەناوبردنی لەناو خەڵكا لەژێر پەردەی نەزانینا مایەوە.

ئیتر تەرمەكە گوێزرایەوە بۆ كۆشكی (تساركۆسیلۆ) بارەگای دێهاتی بنەماڵەی قەیسەر، بەوەی خاوەن شكۆ شاژن ئەیەوێ بۆ دواجار چاوی بە سەروسیمای پیرۆزی كۆچ كردوو بكەوێ، ئیتر تەرمەكەیان لە ژوورێكی نهۆمی خواروی كۆشكەكە دانا، پاشان لەتەك گەورەی كەنیزەكەكانی كۆشكا واتە (ئانا) چوونە بان سەری تەرمەكە هەتا ماڵئاوایی دوایی لێبكەن و نوێژی مردووی لەسەر دابەستن.

دیمەنی راسپۆتین یەكجار تۆقێنەر بوو سەرو سیمای گۆڕا بوو بەوەی ماسی كڕانبوویەوە، تەنیا چاوەكانی نەبێ! كە كراوە بوون بەوێنەی چاوی زیندوو، ئەتوت هەروەك جاری جاران چاوی بڕیوەتە دووچاوی ئەو دوو ژنە لێو بەبارە ئازاراویانە.

هەردووكیان بەدیار تەرمەكەوە بەچۆكا هاتن بۆ ماوەیەكی دوورو درێژ، ئەوەندە بەكوڵ ئەگریان هەموو لەشیان نیشتبووە سەر ئارەقە و لەرزین، لێوە لەرەیان بوو لەبەر گریان و ویرد خوێندن.

پاشان شابانو له کڕنوش بردن ڕاست بووەوە و به (ئانا)ی وت:
-خوشکی شیرینم هەموو شتێك له ژیانی جیهانی ئێمه لەدەست چوو!
پاشان ئەو قسانەی راسپۆتین بۆی قراندبوون کەوتەوە یادی کە نوقلانەی برانەوەی بنەماڵەی قەیسەری بۆ لێدابوون، کە ئەم قسانەی بیرکەوتەوە ئەوەندەی تر باری گران بوو، بەوێنەی شێت هاواری ئەکرد!:
– ئای بۆ کوڕەکەم! ئای بۆ جێنشین! بەجارێ هەمووومان قوڕمان بۆ گیرایەوەو تیاچووین.
پاشان بەرپرچی ئاڵۆزاو و چاوی پڕ لە فرمێسك و بەدەم قوڵپی گریانەوە ڕووی کردە جێگای کوڕە نەخۆشەکەی، بەسەریا چەمایەوە، بەدڵ تەنگیەکەوە وتی:
– ئای کوڕە کەساسەکەم! کێ لەمەولا چاکت ئەکاتەوەو ڕەحمەتی ئاسمانت بەسەردا ئەبارێنێ؟!
لێرەدا (ئانا) بەدوایا هات و کەوتە دڵدانەوەی بەنیازی ژێرکردنەوەی:
– بەڵکو ئەمە خوا بەدەم نزامانەوە بێ، بەزەیی پیامانا بێتەوە بەگورجی ئەڵمانمان بۆ بگەیێنێتە ئێرەو ڕزگارمان بکا بەر لەوەی هەلمان لەدەست دەرچێ، ئەگینا دوژمنەکانمان پارچە پارچەمان ئەکەن....
دیارە مەبەستی لە دوژمن گەلی ڕوس بوو!
ئەلکسندرا سەری شۆڕکردەوەو کەوتە منجە منج:
– تەنیا ئەو هیوایەمان ماوە خۆشەویستەکەم.. لە یەزدان ئەپاڕێمەوە کە (نیقی) بخاتە سەر ڕێگای ڕاست و لەقسەم دەرنەچێ بەگورجی مۆری ئاشت بوونەوە بکا لەگەڵ غلیۆمی دووەم، هەتا خۆمان و ماڵ و منداڵمان لە نەمان و لەناوچوون ڕزگارمان بێ.
لەدوای ئەم هەموو وتووێژە ئایا ڕەوایە لەخۆمان بپرسین:
– کە ئایا راسپۆتین بەڕاستی مرد!؟

**ئەنجامی کاز؟**

دیارە راسپۆتین ڕۆشت بە مردن نەك بە بزر بوون، بەڵێ بە مردن، لەگەڵ ئەوەشا هەر زیندووە چونکە ئەو مێشکانەی ژەهری قسەکانی ئەو کاری لێکردبوون، ئەو دڵانەی ئەو بە جادووگەری بۆ خۆی داگیری کردبوون، هەموویان لەپاش خۆی هەر مانەوە، هەتا ئەوەی بەو تەواو نەکرا ئەمان سەری پێبگرن.

ڕووداوەکانی پاش ئەو هەمووی ئەم ڕاستیەمان بۆ ڕوون ئەکەنەوە بە شێوەیەکی سەرسامی ئەوتۆ کە هێشتا سێ مانگ بەسەر مەرگی ئەوا تێپەڕی نەکردبوو یەك بە یەکی نوقلانەکانی هاتنە دی بەوەی باری وڵات بەتەواوی ئاڵۆزە و کارەساتی ڕوخێنەر سەرانسەری ڕوسیای گرتەوە.

برسێتی پەرەی سەند خەڵکی کەوتنە خۆپیشاندان، داوای نانیان ئەکرد لەبەردەم کۆشکی زستانەدا لە پترس بورگ، بەڵام بە دەسیسەی (بۆرتۆبۆبۆف) ئەو خۆپیشاندانانە بەگوللە بڵاوەیان پێ ئەکرا.

وتارو دووانی خۆ پیشاندەرەکان هەر هیچ نەبوو لەچاو هەڵگەڕانەوەی هێزی چەکدارا، کە ئێش و ئازار گەیشتبووە سەر ئێسك و مۆخیان لەبەر تەراتێنی دزە ناپاکەکان بە نان و بەرگیان ئەو دز و خوێڕیانەی کە شەرەفی وڵاتیان لە کۆڕی جەنگا لکاوی کردبوو، بۆیە ئیتر لە وزەیانا نەما لە ئەنجاما بە شۆڕش ڕاپەڕین.

قەیسەر ناچار بوو لە ١٤ی مانگی ئایار ١٩١٧ واز لە تەختی حوکمڕانی ڕوسیا بێنێ ئەویش بە مۆرکردنی هاتنە خوارەوەی لە تەخت لەناو واگۆنێکی ڕازاوەی شەمەندەفەرا لەکاتی گەڕانەوەیا لە کۆڕی جەنگ بەرەو پایتەخت، ئەو پایتەختەی لەدەست دەرچوو بوو، تازە حکومەتێکی دیموکراتی تیادا دامەزرێنرابوو.

هەموو بنەماڵەی قەیسەر گیران، هەتا خودی قەیسەر لە کۆشکی (شارکۆسیلۆ) توند کرا، ئەو کۆشکەی بۆ دواجار شابانو لە راسپۆتین ماڵئاوایی تیا خواست، ئەو کۆشکەی کە شابانو لەتەک راسپۆتینا بەجووتە پیسترین حمڕانیان تیا گێڕا، هەروەها سەرۆك وەزیرانیش برۆتۆبۆبۆف گیرا و لە قەڵای (پترس و پۆڵس) دا بەند کرا، ئەو شوێنەی بە سەدان ئازادی خوای تیا بەند ئەکرا لە کاتی فەرمانڕەوایی شابانو و راسپۆتینا.

ئایا راسپۆتین بەمردن لە توندو تیژی حکومەتی نوێ قوتاربوو؟ نەخێر چونکە راسپۆتین نەمردبوو وەکو وتمان، بۆیە ڕەوا بوو ئەویش بەشی خۆی بەرکەوێ لە سزا و چەرمەسەری، بەرامبەر کردەوە پیسە لەڕادەبەدەرەکانی کە ژیانی لە هەموو خەڵك تاڵ کردبوو.

بەڵام ئەو میللەتە کە وا باوەڕیان بە ئەفسانە هەیەو مۆمدانەکان ئەپەرستن و بەدوای هەموو دەست بڕو دەروێشێك دا ڕا ئەکەن، ئەو دەروێشانەی بە خواناسی و پیاو چاك خۆیان ئەنوێنن، بەدووری ناگرین ڕۆژێك بێت مەزار بۆ لاشەی نێژراوی هەڵبەستن و شوێنەکەی بکەن بە نزرگەو کەلوپەلەکانی بە موفەڕك....

لەبەرئەوە نوێنەرانی حکومەت بەدزیەوە دەستیان کرد بە پشکنین و گەڕان بەدوای تەرمەکەیا، کە ئەزانرا نێژراوە لەناو تابوتێکا لە نزیك کۆشکی (شارکۆیسیلۆ)ی هاوینەوەو لە گومەزی کڵێسەیەکی بچوکا لەسەر خواست و فەرمایشتی شابانو.

دۆزینەوەی تابوتەکەی شتێکی گران نەبوو هەروەك چۆن ناسینەوەشی سوك و ئاسان بوو بەوەی تابوتەکەی لە بلور دروست کرابوو، هەتا سەرو سیمای پیاوچاك بەدەرەوە بێت لەکاتی تەواف و زیارەتی شابانو لەگەڵ دەست و پێوەندەکانیا بۆ کۆکردنەوەی خێرو بەرەکەتی گۆڕ بەگۆڕەکە،

لەژوور سەریەوە مۆمدانێکی گرانبەها دانرا بوو، ناوی شابانو هەروەها یەك بە یەکی کچەکانی لەسەر نوسرابوو، یەکێ بوو لە یادگاریەکانی گەردن کەچیان لەگەڵ وەفا دارییان بۆی هەتا دوا هەناسەیان.

لەبەرئەوە گومان لە ناسینەوەی لاشەکەیا نەما، لە تابوتەکەیان دەرهێناو خستیانە سەر گالیسکەیەك و کەوتنە ڕێگا بەرەو پترس بورگ، بەڵام گالیسکەکە لە چەند فەرسەخێك بەولاوە دوور نەکەوتەوە، کە گەیشتە بەردەم لیژنەدارێکی کەڵەکە کراوی گەورە نوێنەرەکانی دەوڵەت بەدەر کەوتن، بەگورجی لاشەکەیان خستە سەر کۆمەڵە دارەکەو نەوتیان کرد بەسەریاو ئاگرێکیان تێبەردا.

لە ئاگرەکە تیشکێکی گەورەی سوریاو بەرزبووەوە تێکەڵ بووبوو بە تیشکێکی ڕەنگ کەسکی تاریك، نوێنەرەکان لەمە واقیان وڕماو ترس و تۆقێن دایگرتن و کەوتنە لەرزین، ئەگەر سەریان لە ڕاستیەکەی دەربچووایە دیارە نە ئەکەوتنە لەرزین، چونکە راسپۆتین بە مۆمیا دەرمان کرابوو، ئەو ڕەنگە کەسکە تێرە بەهۆی سوتانی ئەو دەرمانە کیمیاویانەوە بوو کە بەکارهێنرا بوون لە لاشەکەیا هەتا بەگورجی لەناو نەچێت!

بەڵام مێشکی سادەو ساکاری ئەو فەرمانبەرە نەخوێندەوارانە لەکوێ پەی بەم ڕاستیە ئەبەن، لەکاتێکا نەتەوەی ڕوس باوەڕیان بە توانای لەڕادەبەدەری ئاسمانی و شەیتانی هەیە.

کە ڕۆژ گزنگی داو ئاگرەکە کوژایەوە.... کەوتنە ورد و خاش کردنی ئێسکە ڕەقەکانی بە هاڕینی لەژێر پۆستاڵەکانیان، پاشان کەوتنە خۆیان بۆ گەڕانەوە، هەروەك شەیتان ڕایان بنێ، هەتا زوو حاڵ و ئەحواڵ و ئەنجامی کاریان بە فەرمانڕەوا تازەکانیان بگەیێنن..

بەم جۆرە پەردە بەسەر دوا بەشی ئەو ژیانەدا هات کە وەك ئەستێرەی کشاو داگیرساو کوژایەوەو کەوت بەسەر میللەتێکا ژیانی لێ تاڵ کردن و

سەری دەوڵەتێکی خوارد و ڕێگای لە مێژوو گۆڕی!

ئەم دڵدارە دڕندەیە هەڵکەوتوویەکی بێ وێنەی ئەوتۆ بوو لە بومەلەرزە و گەرداو و بورکان و ئەستێرەی کلکداری کشاو ئەچوو، ئەو ڕووداوە سروشتیانەی وشك و تەڕ لەگەڵ خۆیانا ئەسوتێنن لە کەفلەکونێکا.

پاشان چاك و خراپی هەموو کارێك ئەگەڕێتەوە بۆلای خوا...

(تەواو بوو)

## ئەم داستانە!

راسپۆتین چیرۆکی ژیانی ڕاستەقینەی قەشەیەکی دەروون چەپەڵ و ڕەوشت تڕۆیە لە جوتیارێکی کۆلکە خوێندەوارەوە گەیشتۆتە ناو ماڵ و خێزانی قەیسەری ڕوس.

لە جەنگی یەکەمی جیهانی دا گەورەترین تۆڕی سیخوڕی بۆ ئەڵمان گێڕاوە لەدژی ڕژێمی ڕوسیا و تیتاڵی بە بەرژەوەندی ملیۆنەها خەڵکی کەساس و برسی و ڕەش و ڕووتی میللەتانی ژێر چەپۆکی قەیسەری کردووە.

زمانی کوردی لەبارە بۆ وەرگێڕان و دەوڵەمەندبوون بە بەرهەمی چیرۆك و داستانی هەمە ڕەنگەی گەلان.

داستانێك جلوبەرگی ئاڵ و واڵای بوکێنی بەبەردا نەکرێت، گەردانەو مێخەك بەند و خەناوکەی موتو مورووی کەسك و سورو مۆرو زەردی بە وشەو بە بەژن و باڵاو کەمەردا شۆڕ نەکرێتەوە بە وردەکاری بەکارهێنانی وشەو ڕستەی تەڕو پاراوی کوردی نەڕازێنرابێتەوە تاسەو ئارەزووی خوێنەرانی ناشکێنێت.

جەنگیزخان راسپۆتین دوو ئەڵقەن لە بەرهەمی خەرمانی بەبەرهەم هاتووی نوسەرانی هەڵکەوتووی گەلان، لە داهاتووش دا چاوە چاوی درێژەدان بن بەم زنجیرەیە.

